# پێرست

# دەروازەیەکی گشتی

ئەم زنجیرە کتێبە هەوڵ دەدات بۆ توێژینەوە لە پەیوەندی نێوان "فەیلەسوف و ژن"، وەك هەوڵدانێك بۆ دووپاتکردنەوەی ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێت: ئەو وێنە خراپەی لەبارەی ژنەوە باوە, هەر لە سەرەتای فەلسەفەوە فەیلەسوفان لە وڵاتی یۆنان کێشاویانە، ئینجا دوای ئەوە لای ئێمەمانانیش زەمینەی بە پیتی خۆیی دیوەتەوە و بگرە کاڵایەکی ئایینی بە بەردا کراوە و بۆتە

خراپەکان لەبارەی ژنەوە بەرگێکی ئایینیان بە بەردا برا و لەمەشەوە کەوتنە سۆراغکردنی بەڵگە و پشتیوانی خۆیان لە "پەیمانی کۆن/ تەوارات"ـەوە وەدەست خست و لەوێدا هەڵەکەی ئادەمیان بینییەوە کە بە هۆیەوە لە بەهەشت دەرکرا و مردنی هێنایە نێو جیهانەوە، هۆکاری ئەم گوناهەیش: (گوایە) بە تەفرەدانی ژن بوو!.

هەمان شتیش لەبارەی ترادسیۆنی ئیسلامییەوە بڵێ: ئەگەرچی ئیسلام لە دادپەروەری و هەقبەشی (إنصاف)*ـی ئافرەتدا زۆر ڕوون و ڕاشکاوە: نە زیندە بەچاڵ کردن و نە تووڕەیی بە سەریدا و نە چاوترسێنکردنی ئەگەر باوکزادە بێت و نە بێ بەشکردنی لە میرات و نە بە زۆر بە شوودانی و نە سەرپەرشتی بەسەر ماڵ و سامانی و نە دەستگرتن بەسەر بیرکردنەوەی یان بازرگانیەکەی یان ڕۆشنبیریی و فێربوونیدا...هتد[1].

کەچی وێڕای ئەمانەیش دەبینیت ئەو فەیلەسوفانەی ئیسلام کە هزرەکانی فەلسەفەی یۆنانییان دووبارە کردۆتەوە، بە تایبەتیش تیۆری مامۆستای یەکەم لەبارەی ژنەوە، لە توانا و بەهای مێینەیان هێناوەتە خوارێ، تەنانەت تا ئەو جێیە ڕۆیشتوون کە ئەخلاقی پیاویان لە ئەخلاقی ژن جیاکردۆتەوە، ڕێك وەك ئەوەی ئەرستۆ کردی! ئیمامی غەزالی هیچ دڕدۆنگ نەبووە لەوەی بڵێت: «مافی پیاوە شوێنکەوتراو بێت نەك شوێنکەوتە» چوونکە ئەو سەرەوەرە! بۆیە دەبێت «بە ئاسانی و سادەیی نەکەوێتە دەستبازیکردن لەگەڵیدا تا لای ئەو لە شان و شەوکەتی کەم نەبێتەوە»[2]. «زۆربەیان بەد ڕەفتار و کەللەڕەقن و لەواندا ﴿عەقل﴾ نەرم و نیان نابێتەوە مەگەر بە جۆرە نەرم و نیانییەکی

سیاسەتبازانەوە نەبێت»..[3]. هەروەها دەبێت ژن «لە کونجی ماڵەوەدا دابنیشێت و پێویستی بە دەستبازیی مێردەکەی بێ و نابێت زۆر بچێتە سەرەوە، دەبێت لەگەڵ دەر و دراوسێیشدا کەمدوو بێت»[4]. لەسەر مێردەکەیشی پێویستە فێری بکات بۆ ئەوەی بۆ فێربوون نەچێتەوە شوێنێکی تر، هیچ ڕێگرییەکیش نییە لەوەی ئەویش مێردەکەی فێری "زانستی حەیز و حوکمەکانی" بکات ــ کاتی گونجاوی ئەم فێربوونە ئەو کاتەیە کە ژنەکە دەچێتە حەیزەوە.. «تەنانەت ئەگەر پیاوەکەی زانیاریشی کەم بوو، ئەو هەر بۆی نییە بچێتە دەرێ تا پرسیار لە زانایان بکات»...[5]، بەم جۆرە ئیمامی غەزالی ژن لە چوونە دەرێی ماڵەکەی بێ بەش دەکات تەنانەت ئەگەر بۆ زانستیش بێت!

هەر بەم جۆرەش داب و نەریت و عورفەکانی کۆمەڵگە، یان ڕەنگە بەرژەوەندی پیاو و تێرکردنی غرور و لوتبەرزییەکەی بەوە ڕەخسێنەری ئەو دۆخە بێت کە پیاو سەروەرە بەسەر زۆرێك لە هزرە بەرز و باڵاکاندا، ئینجا فەیلەسوفیش دێت بۆ ئەوەی ئەم ترادسیۆنە کۆمەڵایەتییە باوە لە سەردەمەکەی خۆیدا پشت ئەستوور بکات، ئیدی فەیلەسوف ژێرەکەی هەڵدەکۆڵێت تا ئەو ستوونە هزری و کۆڵەکە عەقڵییانەی تێدا بچەسپێنێت کە ئەم نەریتانە پشتیان پێ دەبەستن.

بەڵام بۆچی پەیوەندی نێوان "فەیلەسوف و ژن" بۆ ماوەیەکی درێژ خراپ بووە، کەچی لەگەڵ ئەدیب و مۆسیقار و شاعیردا بەم جۆرە نەبووە؟..؟! چەند بۆچوونێك هەیە بۆ ڕاڤەکردنی ئەم دیاردەیە:

– بۆچوونێك هەیە دەڵێت: ڕەنگە هۆکارەکە لاوازیی ڕواڵەتیی ئافرەت و هەوڵی ڕاڤەکردنی ئەم لاوازییە بێت، کە ئایا بەشێکە لە سروشتی و ناتوانێت تێیپەڕێنێت، یان ئەوەتا شتێکە کۆمەڵگە لەسەری سەپاندوویەتی؟ ڕەنگە ئەمە ئەو کێشەیە بێت کە تا ئەم ساتە وەختە بۆتە هۆی چەوساندنەوەی ژن، لەم ڕووەوە هەندێك لە لێکۆڵەرانیش پێیان وایە دینگەکانی ئەم کێشەیە لە سەردەمی یۆنانیدا ڕەگی داکوتاوە بەجۆرێك کە بۆتە کێشەی "سروشت یان عورف" . ئەو پرسیارەش قووت بۆتەوە کە ئایا ئەو لاوازییەی بە ژنەوە دەردەکەوێت لاوازییەکی کۆمەڵایەتییە کە عورف و داب و نەریتەکان سەپاندوویانە، یان

سروشت سەپاندوویەتی؟ کۆمەڵێك فەیلەسوفی گەورە، لە سەرویشیانەوە سوکرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ و ـــ ئەوانەی بە چەوساندنەوە و سووك ڕوانین لە ژن بەناوبانگ بوون ـــ لایەنگیرییان لەو بیرۆکەیە کردووە کە دەڵێت یاساکان و دام و دەزگاکان و ڕێکخراوە مرۆییەکان سروشتین نەك عورف. هەر لەبەر ئەمەش بوو هێرشیان کردە سەر سۆفیستەکان کە پێیان وابوو ئاکار و بەهاکان و سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان.. هتد، عورفێکن شیاوی گۆڕانن[٦].

واتە ئەم تاقمە پەیوەندی خراپی نێوان "فەیلەسوف و ژن" دەگێڕنەوە بۆ تێڕوانینە گشتییەکەی، یان ڕێبازە فەلسەفییە گشتگیرەکەی.

- بەڵام تاقمێکی تر هەن ئەم پەیوەندییە خراپە دەگێڕنەوە بۆ سروشتی فەلسەفە خۆی نەك بۆ فەلسەفەی هەر فەیلەسوفێك بە جیا. چونکە بە تێڕوانینی ئەم دەستەیە فەلسەفە سۆراغ و لێکۆڵینەوە لە شتە گشتی و ئەبستراکتەکان و ئەوانەی کە دەکەونە سەرووی هەست و هەستەکییەکانەوە دەکات، هەر لێرەشدایە هەڵوێستی دژە ژن، بگرە هەندێ کات سووك ڕوانینیانەی فەیلەسوف لە ژن دێتە گۆڕێ، کە بە زۆری وا لێی دەڕوانێت بە شێوەیەکی گشتی هێمای هەست و جەستە و ژیانی بەشەکییانەی هەستەکییە، بۆیە ئەو پێی وایە ژن بە زەمینەوە شەتەك دراوە، ئەمە لە کاتێکدا فەیلەسوف دەیەوێت بۆ ئەودیوی سروشت لەشەقەی باڵ بدات و بفڕێت تا سیستەمێکی گشتگیری فەلسەفی بۆ خۆی دامەزرێنێت..هتد[٧].

بەڵام ئەم بۆچوونە لە دوو گۆشەوە بۆچوونێکی ناپەسەندە:

گۆشەی یەکەم: ئەوە فەیلەسوفە کە ژن دەکاتە هاو مانای جەستە و ژیانی هەستەکی و هەموو ئەو شتانەی کە بەشەکییە، هەر ئەوە ئەم وێنە هەڵەیەمان پێ دەدات کە دواتر گومانی دەخاتە سەر.

گۆشەی دووەم: زۆر نموونەی ژنانی فەیلەسوف یان ژنانی بیرمەند هەن، بەڵام ئەو یان ڕەتیان دەکاتەوە، یانیش چاویان لێ دەپۆشێت، بە ئەنقەست فەرامۆشیان دەکات، وا حساب دەکات کە بوونیان هەر نییە. خۆ "ئیسپازیا" خاوەنی صالۆنێك هەبوو کە

ئەفلاتون خۆی هامشۆی دەکرد، ژنێك بوو ڕۆڵێکی دیار و بەرچاوی لە سیاسەتدا دەگێڕا و ئەویش لە دیالۆگەکانیدا لەبەر ڕەوانبێژییەکەی باسی کردووە ــ هاوڕێکەی پێرکلیس-، هەروەها "دیۆتیما"ــی مامۆستای سوکرات هەبوو کە لە دیالۆگی خواندا گفتوگۆی خۆشەویستیی سوکراتییانە لە دەوری ئەو دەسوڕێتەوە، وەك چۆن ژنانێکی فەیلەسوف هەبوون لە قوتابخانەی فیساگۆریزمدا[٨]. هەروەها لە بەردەمی ئەرستۆشدا "ئۆلیمپیاس Olympias"ــی ژنی شا فیلیپی مەکدۆنی و دایکی ئەسکەندەری گەورە ــ ژنەمیر و کاهینی بەناوبانگی ئەپیرۆس ــ هەبوو کە تەنیا بە گەیشتنی کەژاوە شاژنییەکەی بۆ قوتابخانەکەی ئەرستۆ ئیدی مامۆستای یەکەم بە هەروەلەوە چۆتە پێشوازی لیٚ کردنی و بەخێرهێنانی، ئەویش بە «ئەو لالەپەتەی کە هزری داهێنەرانەی نییە» وەسفی کردووە، پاشانیش ئەوەی بۆ زیاد کردووە کە «ڕەنگە ناوبانگەکەی بەهۆی ئەوەوە بێت یەکێك بووە لە قوتابییە باشەکانی ئەفلاتون»..[٩].

بۆچونی سێیەمیش هەیە کە دەڵێت ڕەنگە ڕەوشی کەسەکییانەی فەیلەسوف و پەیوەندییەکەی بە ژنەکەی یان خۆشەویستەکەی ــ هەڵوێستی ئەو فەیلەسوفە بەرامبەر بە ژن ئاوەژوو بکاتەوە.

ئێمە نکوڵی لەوە ناکەین ڕەنگە ئەم کارکردە ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبێت لە بۆچوونی هەندێك فەیلەسوف لەبارەی ژنەوە، وەك ئەوەی لە کۆندا لای سوکرات دەیبینینەوە کە داد لە دەست ژنەکەی دەکات ــ کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا بە قوتابییەکانی دەڵێت «هاوسەرگیریی بکەن، جا یان بەختەوەر دەبن، یان وەکو من دەبنە فەیلەسوف»! وەك چۆن ئەمە لای هەندێك فەیلەسوفی مەسیحییش دەبینینەوە کە لە ژمارەی سێیەمی ئەم زنجیرە کتێبەدا باسی لیٚ دەکەین. وەلیٚ فەیلەسوفانێکیش هەبوون هەرگیز هاوسەرگیرییان نەکردووە وەکو ئەفلاتون، کەچی بۆچوونیشیان سەبارەت بە ژن ئەو پەڕی خراپ بووە. فەیلەسوفانێکی وەك ئەرستۆش هەبوون دووجار هاوسەرگیرییان کردووە، لە ژیانی تایبەتییانەوە شتێکی ئەوتۆ شك نابەین کە ڕاڤەی ڕق و کینەیانمان لە ژن بۆ بکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە وا دەردەکەوێت ئەرستۆ لە هەردوو جارەکەدا ئاسوودە و بەختەوەر بووە!.

بەڵام لە ڕوانگەی ئێمەوە ڕاڤەی گونجاو پشت دەبەستێ بە ڕوونکردنەوەی ئەو کارەی فەیلەسوف ئەنجامی دەدات، ئەویش هەڵکۆڵینی ترادسیۆنی کولتووری لە سەردەمەکەی خۆیدا بە مەبەستی کەشفکردنی ئەو هزرانەی بە کۆڵەکەگەلێك دەدرێنە قەڵەم کە ئەم ترادسیۆنە پشتیان پێ دەبەستێت و پاشانیش بە ڕەخنە و تاقیکردنەوە بایەخیان پێ دەدات، خۆ ئەگەر لەم هزرانەدا ڕێکەوتی ئارەزووەکانی دەروونی خۆیی کرد، ئەوا کار دەکات بۆ پشت ئەستوورکردن و جەخت لێ کردنەوەی، بێگومانیش بۆچوونە دژە ژنانەکان و ئەو بۆچوونانەی دەیکەنە موڵکی تایبەتی پیاو بۆ فەیلەسوف سوودبەخش و بە کەڵك بوون و جێی پەسەندی غرور و خۆگەورەبینییەکەی بوون، هەر لێرەشەوە و ڕەنگە بێ ئاگایانە، کاری کردووە بۆ پشتیوانی لێ کردنی و پەیڕەوی لێ کردنی لە تیۆری فەلسەفی ئەبستراکتدا!.

بەڵام ئەوە چییە وا لە پیاو دەکات، جا چ فەیلوسوف بێت یان ڕێبوارێکی سەرەڕێ، بەم سووکیە تەماشای ژن بکات؟ وا پێدەچێت پەرەسەندنی ڕەوشی ژن لە کۆمەڵگەدا هەر لە سەرەتاکانی یەکەمی ژیانی مرۆییەوە پەیوەست بووە بە موڵکایەتی تایبەتەوە، لە قۆناغەکانی بەر لە پەیدابوونی خاوەندارێتی ــ یان ئەو کاتەی کە کۆمۆن هەبووە ــ کۆمۆنەی ڕەگەزییش باو بووە، ئەمەش ڕاستییەکە زانای ئەنترۆپۆلۆژی ئەمریکی "لویس مۆرگان "L. Morgan ١٨١٨-١٨٨١ز)، کەشفی کردووە[١٠]. پاشان لە قۆناغێك لە قۆناغەکاندا لای گەلە سەرەتاییە جیاوازەکانی وەکو ئەسکیمۆ نەریتی پێشکەشکردنی ژنە هاوسەرەکان بۆ میوانە ناسراوەکان و نەریتی گۆڕینەوەی ژنەکان..هتد، باو بووە.

بەڵام لەگەڵ گەشەسەندنی موڵکایەتی تایبەتدا پیاو هەستی بە گرنگی پاکداوێنی ژنەکەی و بێ گەردی بنەماڵەکەی کردووە، لەبەر ئەوەی ئێستا "خاوەندارە" و دەیەوێت ئەوەی هەیەتی بۆ منداڵگەلێکی جێ بهێڵێت لە پشتی خۆی بن، کەواتە دەبێت "بە پاکی" پارێزگاری لە ژنەکەی بکات –ئەو دەفرەی کە وەچەی بۆ بەرهەم دێنێت ــ بە جۆرێك کە "خوێنی بێگانە" نەکەوێتە نێو خێزانەکەوە. بەم جۆرە بیرۆکەی ئافرەتی حەرەمسەرا و شاردنەوەی ژن لە چاوی خەڵکی کە هیچ پیاوێکی دیکە نەیبینێت سەری

هەڵدا، تەنانەت ئەگەر بە ڕێ و بانەکانیشدا بڕۆشتایە دەبوو پەچەپۆش و داپۆشراو بێت. ئینجا کۆمەڵگە لەبەر هۆکارگەلێکی تەواو ئابووری پەچە یان حیجابی بەسەر ژنی ئازاد (یان هاوسەر)دا سەپاند، هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە مێرد دەیویست بە هەمووانی ڕابگەیەنێت کە ژنەکەی ژنێکی ئازادە و مولکێکی تایبەتە کە نابێت بکەوێتە بەرچاوانی تر، ئەوەش جیاوازە لەو ژنانەی مولکی گشتی بوون: کەنیزەکەکان و سۆزانی و لەشفرۆشەکان..هتد، ئەوەش لە کۆمەڵگەی شارستانییەتە کۆنەکاندا، لە یۆناندا هەر لە سەردەمی "هۆمیرۆس" و "هزیود"ەوە دەرکەوتووە، و لە سەردەمی گەورە فەیلەسوفەکانی یۆناندا بەردەوام بووە: سوکرات، ئەفلاتون، ئەرستۆ، بگرە تا ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانییش درێژەی کێشاوە. دوای دەرکەوتنی مەسیحییەت حیجاب و پەچە بە رگێکی ئایینیان بەخۆیانەوە گرتووە، ئیدی ژنی مەسیحی بۆی نەبووە بە سەری ڕووت بڕواتە دەرەوە، خۆ ئەگەر لە کەنیسەشدا بەم جۆرە دەربکەوێت، وەك قەدیس پۆلس دەیڵێت دەبێت بە بڕینی قژەکەی سزا بدرێت، وەك لە ژمارەی سێیەمی ئەم زنجیرە کتێبەدا دەیبینین[11]. ئەمەش مێژووی ئیسلامی جەختی لەسەر دەکاتەوە و وەك دەگێڕێتەوە عومەری کوڕی خەتاب بە ڕێ و بانی شاردا پیاسەی دەکرد، ئەگەر کەنیزەکێکی موحەجەبە یان پەچەپۆشی بدیبایە بە قامچی تێی دەکەوت تا ڕووپۆشەکە (حیجاب) یان پەچەکە لەسەری دەکەوتە خوارێ — و ئینجا بە نکوڵییەوە دەیگووت «خۆت بە ژنی ئازاد ئەچوێنیت؟». جیاکردنەوەکە لێرەدا کۆمەڵایەتی و ئابوورییە، خۆ ئەگەر پرسەکە ئەرکێکی ئایینی بووایە ئەوا فاروق تێیدا کەنیزەك و ژنی ئازادی یەکسان دەکرد ئەگەر هەردووکیان موسڵمان بوونایە[12].

بنچینەی ئەم جیاکردنەوەیە ئەوەیە گەر ژن تاوانی زینا بکات ئەوا نەوەی هاونیشتمانی پیس دەبێت، ئینجا منداڵگەلێك دەخەنەوە لە پشتی خۆی نین تا ببنە میراتگری سامانی مادی یان مەعنەوی یان هەردووکیان پێکەوە، لە کاتێکدا تاوانی مێرد نابێتە هۆی ئەمە. لێرەوە هەموو کۆمەڵگا کۆنەکان بەرامبەر زینای ژن توندوتیژ بوون و بگرە سزاکەی لەسێدارەدان، یان سەنگەسارکردن تا مردن بووە، ئەمە لەکاتێکدا بۆ

پیاو ڕێ پێدراو بووە مومارەسەی سێکس لەگەڵ کەنیزەك و سۆزانی و لەشفرۆشەکان و..هتد بکات، ئەوەش لەبەرئەوەی نەوەی کەنیزەکەکە —تۆ جاریێ واز لە هەڵەکە بهێنە ــ نابێتە میراتگر، هەروەها سەر بە دایکیشییەتی، خۆ ئەگەر جیاوکی ئەدەبی یان سیاسیش هەبێت، وەك ئەوەی لە کۆمەڵگەی یۆنانی یان ڕۆمانیدا هەبوو — ئیدی هیچ ترسێك نەبوو لە دزەکردن بۆ نێو "خوێنی بێگانە".

بەم جۆرە بە درێژایی مێژوو، پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان خاوەندارێتی تایبەتی و ڕەوشی ژن لە حەرەمسەرادا هەبووە بۆ شاردنەوەی لە چاوان تا هەرگیز کەس نەیبینێت، وەك هەوڵدان بۆ "خاوێنکردنەوەی" تا ببێتە دەفرێکی بێ گەردی بەرهەمهێنانی بنەماڵەیەکی فەراهەم لە پشتی پیاو، تا ببێتە میراتگری هەموو ماڵ و سامانە مادی یان مەعنەوییەکان یان هەر دووکیان پێکەوە، ڕۆڵی فەیلەسوفیش بۆ ماوەیەکی زەمەنیی درێژ، تۆمارکردن و بە ڕێساکردنی ئەم ڕەوشە نزمەی ژن، خستنەڕووی پاساوی عەقڵی یان سروشتی یان بایلۆژی یان سیاسی..هتد بووە کە بەوە پاسادانی سروشتی شتەکان وەهان و ئەم ڕەوشە نموونەییەش کە سروشت یان ئاسمان یان هەردووکیان پێکەوە سەپاندوویانە: ئەوەی پیاو سەروەر و فەرماندەر و زاڵ بێت، ژنیش ملکەچ و شوێنکەوتە و گوێڕایەڵ بێت! وا گومان دەبەم کاتێك خوێنەری عەرەبی تیۆری ئەرستۆ لەبارەی ژنەوە—ژمارەی دووەم لەم زنجیرەیەدا ــ ئەخوێنێتەوە و کاتێك پاساوەکانی خۆی دەخاتە ڕوو جارێك لە میتافیزیکەوە و جارێك لە بیۆلۆژیاوە و جارێکی دیکە لە سیاسەتەوە..هتد و لە ماڵەکەی خۆیدا دەبینێت، هەرچی مامۆستای یەکەم گوتوویەتی لە کولتووری کۆمەڵگەکەی دەوروبەریدا و لە بەرگێکی ئاییینیدا جێی خۆی گرتووە، ئەگەرچی ئەرستۆ بە داخەوە بتپەرست (وەسەنی) بووە!

"فەیلەسوف و ژن" ئەو زنجیرەیەیە کە لەم ڕۆژگارەدا پێشکەش بە خوێنەری عەرەبی دەکەین، کە تاوتوێ و چارەسەی بابەتێکی ئێجگار گرنگ دەکات چونکە لەلایەکەوە ڕاستەوخۆ دەست لە ژیانی ڕۆژانەمان دەدات و لەلایەکی دیکەیشەوە بابەتێکی نوێ و بێ

پێشینە و دەست بۆ نەبراوە، ئەوەندەی من بزانم، هیچ کەسێك پێشتر لەبارەیەوە نەینوسیوە.

لە کۆتاییدا ئومێدەوارم بە پێشکەشکردنی ئەم زنجیرە کتێبە، شتێکی نوێم خستبێتە نێو کتێبخانەی عەرەبییەوە، لای خۆمەوە بەڕادەیەك، ئەگەرچی کەمیش بێت، بەشداریم لە ڕێڕەوی ڕۆشنگەریدا کردبێت.

داوا لە خودا دەکەین هەمووومان بۆ سەر ڕێگای ڕاست ڕێنمونی بکات.

ئیمام عەبدولفەتاح ئیمام
کوەیت، ٢٨ی فێبریوەری ١٩٩٥

# پێشەکی

ئەو پرسەی ئەم لێکۆڵینەوەیە دەیخاتە بەر توێژینەوە پوختەکەی ئەوەیە هەوڵ دەدات بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە: ئایا بە ڕاستی ئەفلاتون پشتیوانی ژن بووە؟ ئایا ئەو یەکەم فەیلەسوف بووە بانگەشەی یەکسانی ژن و پیاوی کردووە؟ وەك ئەوەی لە زۆر کتێبی فەلسەفیدا باسی لێ کراوە، ئایا بە ڕاستی ئەفلاتوون پەیامبەری مافەکانی ژن بووە لە جیهانی کۆندا؟ ئەی ئایا کاتێك داوای سەرکەوتنی ژنی بەسەر زیندانی حەرەمەکەیدا کردووە پێش "بزوتنەوەی ژنان" کەوتووە؟

بۆ ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە کە لێکۆڵەران وەك "مەتەڵێکی سەرسامکەر" پەسنی دەدەن، ئەوا دەبێت لێکۆڵینەوەکە بەسەر دوو دەروازەی گەورەدا دابەش بکەین: دەروازەی یەکەم لەبارەی "ژن لە کۆمەڵگای یۆنانیدا" کە لە دوو بەشدا دەخرێتە ڕوو وەك ئەو باکگراوندە کولتوورییەی کە ئەفلاتون تێیدا ژیاوە، بۆیە بەشی یەکەم لەبارەی سەردەمی پاڵەوانێتی و ئەفسانەکانەوە دەدوێت، ڕەوشی ژن لەم ئەفسانانەدا کە "خەونەکانی مرۆڤ" بوون دەردەخات ـــ ئەو هەلومەرجەش زۆری فەرق نییە لە هەلومەرجەکەی لەسەر زەمین. بەشی دووەمیش باس لە سەردەمی کلاسیکی دەکات: ژن لە ئەسینادا کە لەوێ ئەفلاتون لەدایك بووە و پێگەیشتووە و قوتابخانەکەی دامەزراندووە..هتد. ئینجا ژن لە سپارتە کە دەڵێن فەیلەسوفەکەمان زۆر لەژێر کاریگەری سپارتەدا بووە. ئەم دەروازەیە وا کۆتایی پێ دێنین کە ڕەوشی ژن لە کۆمەڵگای یۆنانیدا، بە شێوەیەکی گشتی، هەلومەرجێکی خراپی هەبووە، ئەسینا لە کونجێکی تاریکدا کە "حەرەمسەرا" بووە، زیندانیی کردووە و بێ بەشی کردووە لە چوونە دەرەوە و هەر کاتیش چووبایە دەبوو ڕووگرێکی بەڕوویدا بدایە تا بەهۆیەوە بۆ هەمووانی دەربخستایە "موڵکی تایبەت"ـی پیاوێکە و پێویستە لێی نزیك نەبنەوە. لە کاتێکدا سپارتەش لە مێینەیی خۆی دایماڵی بوو و گۆڕیبووی بۆ ژنێکی "بە پیاو بوو" کە هەست و سۆزەکانی بەلاوە

گرنگ نەبوو تەنانەت ئەگەر هەست و سۆزی دایکانەیش بووایە، ئەوەش بۆ ئەوەی ببێتە "ژنێکی بەهێز" کە تەنیا شۆڕەسوارەکان بخاتەوە.

لە دەروازەی دووەمدا لە سێ بەشدا دەست دەکەین بە توێژینەوە لە هزرەکانی ئەفلاتون لەبارەی ژنەوە:

## بەشی یەکەم:

ژن لە دیالۆگی کۆماردا، تێیدا باس لەو کۆمەڵگە ئایدیالییە دەکرێت کە ئەفلاتون تەمای بوو دایمەزرێنێت، هەورەها لەو دەستەبژێرە پاسەوانەیش کە بۆ فەرمانڕەوایی هەڵبژێردبوون و موڵکایەتی لێ قەدەغە کردبوون چونکە گوایە سەرچاوەی لەتبوون و رقەبەرایەتییە. پاشانیش خێزان ون دەبێت و لەگەڵ ونبوونیشیدا ڕۆڵی تەقلیدییانەی ژن بزر دەبێ (بە جۆرێك ئەفلاتون بڕوای وابووە ژن موڵکی خێزانە ئەگەر موڵکایەتی هەڵوەشێنرێتەوە ئەوا ژن لە ڕۆڵە سروشتییەکەی خۆی دەربازی دەبێت) ئەی ڕۆڵە نوێیەکەی چییە؟ وەزیفەی ژن دوای هەڵوەشانەوەی خێزان چییە؟ لێرەدا فەیلەسوفەکەمان ژن دەگۆڕێت بۆ "پیاو" و جۆرە مەشقێکی وەهای لەسەر جەنگ و کوشتار پێ دەکات وەك ئەوەی پیاو دەیکات، و ئیدی بێ هیچ شەرمێك ئەو ژنە جەنگاوەرە. لەنێو پیاواندا دەژی وەك ئەوەی یەکێکە لەوان. جیاوازی لەنێوان ئەو و پیاودا تەنیا وەك جیاوازی نێوان پیاوێکی قژبەسەر و پیاوێکی کەچەڵە.

## بەشی دووەم:

توێژینەوە لە ژن دەکات لە دیالۆگی یاساکاندا و ئەو پرسەی پێشتر دووپات دەکاتەوە و دەیچەسپێنێت، لەم دیالۆگەدا ئەفلاتون ڕێ بە گەڕانەوەی موڵکایەتی دەدات، بەم جۆرەش سەر لەنوێ خێزان پەیدا دەبێتەوە. بە گەڕانەوەی خێزانیش ژن دەچێتەوە سەر وەزیفەکەی پێشتری "سەرپەرشتیاری ماڵ". لێرەشدا جیاوازی لەنێوان ژن و پیاودا لە مەشقە وەرزشییەکان و فێربوونی میوزیك و پیشەی وەزیفە جیاوازەکانی دەوڵەت و

بەشداریکردن لە ژیانی گشتی و بەتایبەتیش لایەنە سیاسییەکانیدا دەردەکەوێت، تەنانەت ئەفلاتون باس لە تاکە وەزیفەیەکیش ناکات کە بکرێت ئافرەت پێیەوە سەرقاڵ بێت مەگەر لیژنەی سەرپەرشتیکردنی هاوسەرگیری، ئەم لیژنەیەش لە کۆمەڵێك پیرێژن پێکهاتووە، ئەوەش وەزیفەیەك بوو کە ژنە پیرەکانی ئەسینا بە کردەیی ئەنجامیان دەدا. هەر لێرەشدایە دیسان دەسەڵاتی پیاو دێتەوە گۆڕێ و "بە واجب دەبێ لەلایەن ژن و منداڵەکان پێکەوە ڕێزی لێ بگیرێت" چونکە ئەو پڕ بە پێستی وشەکە"خاوەن"ـی خێزانە، بۆ نموونە، ئەو دەتوانێت منداڵەکەی ببەخشێت بەو کەسەی کە دەیەوێت تەبەنیی بکات (هەڵی بگرێتەوە). وێڕای ئەوانەش ژن لە یاساکانی ئەفلاتوندا نا کاملێ و کەم و کورتە، بۆیە مافی میراتگریی نیە و دەبێت سۆراغی پیاوێکی تر بکرێت تا ببێتە میراتگری پیاوە مردووەکە وەك بڵێی ژنەکە بۆی نییە هاوسەرگیریی بکاتەوە.. خۆ دەبێت سەرپەرشتیارێك هەبێت بۆ سەرپەرشتیکردنی موڵکەکان، ئەوەش ئەو پیاوە ئەنجامی دەدات.

**بەشی سێیەم:**

لە دەوری ئەوینی نێوداری ئەفلاتونی و پەیوەندییەکەی بە ژنەوە دەسوڕێتەوە، هەندێك پێیان وایە ئەوینی ئەفلاتونی "خۆشەویستییەکی پاکیزەییە" لەنێوان پیاو و ژندا، ڕاستییەکەی ئەم بۆچوونە هیچ بنچینەیەکی دروستی نییە، لەبەرئەوەی "سێکسی هاوڕەگەزی/ هاوڕەگەزبازیی" لای یۆنان باو و بڵاو بوو، وێڕای ئەوەی ئەفلاتون بە توندی هێرشی کردۆتە سەری و وا وەسفی کردووە کە سووکایەتیکردنە نەك تەنیا بە مرۆڤایەتی مرۆڤ بەڵکو بە ئاژەڵایەتی مرۆڤیش، کەچی ئەم هێرشە لە بەرژەوەندی ڕەگەزەکەی دیکە نەکەوتەوە واتە لە بەرژەوەندی پەیوەندی نێوان پیاو و ژن، بەڵکو بۆ بەرزکردنەوەی هاوڕێیەتی پیاو و پیاو بوو تا ئاستی خۆشەویستی بەرز و باڵا، پاشانیش ئەو بەشە بەوە کۆتایی پێ دێت کە ئەوینی بەناوبانگی ئەفلاتونی هیچ پەیوەندییەکی بە خۆشەویستی نێوان پیاو و ژنەوە نییە، بەڵکو بەرزکردنەوەی نێربازییە. یاخود بە باڵابردنی

هاوڕەگەزبازییە. ڕاستییەکەی ئەفلاتون ڕقی لە هەموو جۆرە پەیوەندییەکی سێکسی بوو، چونکە بۆ گونجان و تەبایی لەگەڵ میتافیزیکاکەیدا مادەی سەرکەوت کرد، ئینجا جەستەیشی سەرکوت کرد و بە زیندانی روحی دایە قەڵەم. لەبەرئەمە پەیوەندیی سێکسییانەی نێوان پیاو و ژنی تەنیا لە وەچەخستنەوەدا کورت کردەوە بۆ ئەوەی جۆریی مرۆیی لە نێو نەچێت.

لە هەموو ئەوانەشەوە ئەنجامگیریی ئەوە ئەکەین کە ئەفلاتون لە جوغزی ترادسیۆنی یۆنانی دەرنەچووە کە لە نێو خۆیدا دژایەتی، ئەگەر نەڵێین چەوساندنەوەی ـــ ژنی هەڵگرتووە، بۆیە ئەوەی دەوترێت گوایە ئەو یەکەم کەس بووە بانگەشەی ئازادبوونی ژنی کردووە، یان ئەوەی بانگەشەی یەکسانیی ژن و پیاوی کردووە ڕاست نییە، لەبەرئەوەی دەستەواژەی یەکسانی لە "دیالۆگی کۆمار"دا فریودەرانەیە. چونکە لەبەر خاتری خۆی مەبەست نەبووە، بەڵکو لە بەرئەنجامی هەڵوەشانەوەی "بوونی ژن" و گۆڕینی بۆ پیاو، لە بەرەنجامی هەڵوشانەوەی خاوەندارێتی و لەنێوچوونی خێزان کەوتۆتەوە، ئینجا لەنێوچوونی ڕۆڵی تەقلیدییانەی ژن وەك سەرپەرشتیاری ماڵ، چونکە ئیدی ماڵێك لە ئارادا نییە. بەڵام کاتێك ماڵ دێتەوە گۆڕێ ژنیش دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆڵە تەقلیدییەکەی خۆی.

بەم جۆرەش دەگەینە ئەنجامێکی گرنگ ئەویش ئەوەیە ئەفلاتون ڕەنگدەرەوەی "چەوساندنەوەی ژن"ـە کە ئەمە لە ترادسیۆنی یۆنانیدا نەریتێکی ڕەسەن بووە و ئەو گوزارشتێکی ڕوون و ڕاشکاوانەیە لە سەردەمەکەی خۆی، ئەمەش وەك ڕاستییەك لەسەر ئەو قسەیەی هیگڵ کە دەڵێت: «فەلسەفە بریتییە لە پوختەکراوی سەردەمەکەی خۆی لە هزردا. وەك چۆن گەمژەییە پێمان وابێت تاك دەتوانێ زەمەنی خۆی تێپەڕێنێت، ئاوهاش گەمژەییە پێمان وابێت فەلسەفە دەتوانێت زەمەنە تایبەتییەکەی خۆی تێپەڕێنێت».[١٣].

لە ژمارەی داهاتووی ئەم زنجیرەیەدا دەبینین ئەرستۆ چۆن تیۆرێکی کامڵ دادەڕێژێت بۆ ئەوەی لە ـــلایەنی عەقڵیی پەتییەوە ـــ دووپاتی ڕەوشی نزمی ژن بکاتەوە کە لە ترادسیۆنی کۆنی یۆنانیدا باو بووە.

## دەستپێك

"ویل دیورانت" سەرسامییەکی ئێجگار زۆر بە گەشەسەندنی شارستانێتی یۆنانی پیشان دەدات بێ ئەوەی ژن پشکێکی تیایدا هەبووبێت[١٤]: «ژنە شووکردووەکان لە مێژووی یۆنانیدا لە شەو ڕۆژێکدا ون بوون، وەك ئەوەی قەدەر ویستبێتی پاساوی ئەو کەسانە پوچەڵ بکاتەوە کە دەڵێن پەیوەستییەك هەیە لەنێوان ئاستی شارستانی وڵاتێك و پێگەی ژن لەو وڵاتەدا»[١٥]. ژنان لە کۆمەڵگەی یۆنانیدا، و لەگەڵیشیاندا کۆیلەکان، گرنگترین توێژ بوون کە لەنێو کەرتە تایبەتییەکاندا وەگیر درابوون، خۆ شوێنەکانی وتاری سیاسیی گشتی تەنیا لە هاونیشتمانییە نێرەکاندا کورت دەبوویەوە، نە ژن و نە کۆیلەکان بۆیان نەبوو توخنی کەون، چوون دەبوو زمانیان لە باسکردنی پرسە گشتییەکانی ژیانی ڕۆژانە بگرن[١٦]. ئەوەش هاو کات لە ئەسینا و سپارتەیشدا باو بووە وێڕای جیاوازییەکانی نێوان ئەم دوو شارە.

بەڵام هەموو ئەمانە مانای ئەوە نییە ژن هەرگیز بە ڕێژەیەکی کەم تا زۆر لە ژیانی یۆنانیدا بەشدار نەبووە، لە ئەسینادا ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە لە ماڵدا —لەو کونجە دوورەپەرێزەی ماڵدا کە ناوی نراوە "حەرەمسەرا La Gynecee" — هەر لە پەروەردەکردنی منداڵەوە هەتا چنین و خاوکردنەوەی لۆکە و دروستکردنی جل و بەرگ بۆ خۆی و منداڵەکانی و ڕەنگە بۆ مێردەکەیشی..هتد. ئەمەش وای کردووە "پیاوی ئازاد" بتوانێت بەشێوەیەکی عەقڵانی و ڕووناکبیرییەکی بەرز بژی، چوون ژنەکەی هەلی کاتی بەتاڵی ئەوتۆی بۆ ڕەخساندبوو کە بتوانێت بەرهەمی ئەدەبی و فەلسەفی و بەشێوەیەکی گشتیش کاری سیاسی بەرهەم بهێنێت.

ئەو ماڵەی کە پیاوی یۆنانی وای دەبینی "بواری تایبەت"ـە بواری "نا ئازادی"ی بووە ئەگەرچی هەر ئەم ماڵە هەم بواری بەرهەمهێنان و هەم بواری

نەوەخستنەوەش بووبێت[17]. ماڵ "زیندانێکی بەرهەمدار" بووە کە تێیدا ڕێ بە ژن دراوە کار بکات و بەرهەم بهێنێت، بەڵام ڕێی نەداوە لێی بچێتە دەرەوە، وەك تیوکیدیدز دەڵێت دەبوو «ناوی خانمە چاککەرەوەکە لە ماڵدا بەند بکرێ وەك چۆن دەبوو جەستەیشی تێدا بەند بێت»..[18].

"زەینەفۆن" ئامۆژگاری داوە کە کێلون و کلۆم لە دەرگای ئەو شوێنە بدرێت کە لە ماڵدا بۆ ژن دانراوە. "ئەرستۆڤان"یش دەڵێت ئەوان سەگیان ڕاگرتووە بۆ گەستن تا پاسەوانی ژنەکان بکات و پیاوە دۆستەکانیان بترسێنن[19]. ئەم دۆخە سەیرە ئەو کارە بووە کە خواوەندەکان فەرمانیان پێ کردووە و مرۆڤیش پێی ڕازی بووە و چەسپاندوویەتی، زەینەفۆن دەڵێت: «پیاوان بە پێچەوانەی وەحشە وشکاوەکییەکانەوە پێویستیان بە پەناگە و لانەیە، بەڵام پێویستیان بە هەوای ئازادیشە.

وەلێ ژنان بە سروشتی خۆیان بۆ چالاکی نێو ماڵ دەشێن، پیاو دەتوانێت بەرگەی گەرما و سەرما و گەشتی دورودرێژ و خزمەتی سەربازی و کار لە دەرەوەی ماڵدا بگرێت. خودا فەرمانی بەمانە کردووە و یاسا مرۆییەکانیش سەلماندوویانە، شەریفترین ژن ئەوەیە کە لە ماڵ دەمێنێتەوە نەك لە دەرەوە و بۆ پیاوانیش پێچەوانەی ئەمە ڕاستە. خۆ ئەگەر پیاو ڕێگایەکی جیاواز و ناکۆك بەو ڕێگایە بگرێتە بەر کە خواوەندەکان بۆیان دیاری کردووە ئەوا سزای ئەدرێت چونکە لە ئەرکەکانیدا سستی نواندووە و لێ خۆشبونیشی بۆ نییە»[20].

بەڵام ژنی سپارتەیی، وەك دوای کەمێکی تر دەبینین، لە پێکهێنان و پەروەردەی منداڵان و پێگەیاندنیان و کردنیان شۆرەسواران هاوبەشی پیاویی کردووە، ئەمەش وەك ئامادەکردنێك تا بیاننێرن بۆ گۆڕەپانی جەنگ. هەر ئەوەندە نا بگرە لە ماڵیشدا کچەکانیان ڕا دەهێنا لەسەر خشونەت و "پیاوەتی" و ژیانی سەخت تاوەکو ببێتە "دایکێك"ـی جوامێر کە جوامێرەکان بخاتەوە.

واتای ئەمە ئەوەیە ژنی "ئازاد"ی یۆنانی[21]، بە پشکێکی تایبەت بەشداری کردووە لە بنیاتنانی شارستانێتی یۆنانیدا کاتێك ئەرکە ماڵییەکانی خۆیی لە

"ئەسینا"دا ئەنجامداوە ــ یاخود ئەو ئەرکانەی ئەنجامداوە کە دەوڵەت لە سپارتە بەسەریدا سەپاندوویەتی. بێ ئەوەی لێرە و لەوێ، مافی "هاونیشتمانێتی" و بەتایبەتیش مافە سیاسییەکانی هەبێت، ئەمەش کردوویەتی بە پێگەیەکی ناوەند لەنێوان کۆیلەکان و پیاوانی ئازاددا. لەبەرئەمە هزرەکانی ئەفلاتون لەبارەی پێگەی ژنەوە ــبەتایبەت دیالۆگی کۆمار و ئەو بانگەشانەی کە بۆ فێرکردنی پاسەوانە پیاو و ژنەکان پێکەوە و بەشداری پێکردنی ژنان بە پاڵ پیاوانەوە لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دەوڵەتدا دەیکردن ــ لەنێو ئەم تاریکییە قورسەدا بانگەشەیەکی بوێرانە بوون. تەنانەت دەڵێن گوایە ئەو یەکەم فەیلەسوف بووە بە سەرسەختی بانگەشەی بۆ یەکسانی لەنێوان پیاوان و ژناندا کردووە[٢٢]. "گروب Grube"ــیش بە پەیامبەری مافی ژنان وەسفی دەکات[٢٣]. گوایە لەو سەردەمەشدا لە حکومەتی یۆنانی بێزار و قەڵس بووە لەبەر ئەو مامەڵەیەی کە حکومەتەکە لەگەڵ ژندا کردوویەتی[٢٤]. "دیۆرانت"ــیش ــوەك زۆرێکی تر ــ دەگاتە ئەو بەرەنجامەی کە ئەفلاتون لە بەهێزترین لایەنگرانی ژن بووە[٢٥].

ئەوەی ڕاستی بێت بابەتی "ئەفلاتون و ژن" لەو بابەتانەیە کە بۆ لێکۆڵەر ئێجگار جێگای دودڵی و سەرسامییە، پاشانیش لێکۆڵەران فرە بۆ چوونن و لە هەندێك کاتیشدا تا ڕادەی دژیەکی لێك جیاوازن. ئەمەش وای کردوو خانمە لێکۆڵەرێکی وەکو "سوزان ئۆوکین" وا پەسنی ئەم کێشەیە بدات کە "مەتەڵێکی سەرسامکەرە و شیاوی هەڵهێنان نییە". باشە چۆن دەکرێت بیرمەندێکی بیرکۆکی وەك ئەفلاتون لە یەك کاتدا بۆچونی پارێزکار و کۆنەپەرستانە و بگرە دژە ژنانەش ــ کە دژایەتی ژنانی لە ترادسیۆنی باوی یۆناندا دەنواندەوە، ئەگەر نەڵێین چەوساندنەوەی ژن و سووك کردنی ــ بە پاڵ هزرگەلی "شۆڕشگێڕانە" و "ڕادیکاڵی"ــییەوە کۆ بکاتەوە تا ڕادەی بەرزکردنەوەی ژنان بۆ ئاستی فەیلەسوفە فەرمانڕەواکان لە دەوڵەتە ئایدیالییەکەیدا..؟[٢٦].

لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵ دەدەین ڕۆشنایی بخەینە سەر ئەم کێشەیە بە ئومێدی "هەڵهێنانی ئەو مەتەڵە"ی کە ئەو خانمە لێکۆڵەرە ئاماژەی بۆ دەکات. ئەگەر چی دەبێت یەکەمجار تاوتوێی ئەو باکگراوندە کولتوورییە بکەین کە لە سەردەمی ئەفلاتوندا لە کۆمەڵگای یۆنانیدا باو بووە تا بە "پێگەی ژن" ئاشنا ببین پاشان لەبارەی ئەو بیرۆکە "نوێ"ـیەی کە فەیلەسوفەکەمان لەم بارەیەوە هێناویەتییە کایە، پرسیار لە خۆمان دەکەین.

ئەو باکگراوندە کولتوورییەی کە مەبەستمانە ترادسیۆنی یۆنانییە لە سەردەمە مێژووییە جیا جیاکاندا. مێژوونووسەکان ئەم سەردەمانە لەڕووی کولتوورییەوە دابەش دەکەن بەسەر دوو سەردەمی جیاوازدا، کە لەڕووی تێڕوانیانەوە بۆ ژن لێك نزیکن، ئەوانیش سەردەمی پاڵەوانێتی و سەردەمی کلاسیکین، پێویستە ئێمەش بە گوێرەی ئەم ڕیزبەندییە باسیان بکەین.

# بەشی یەکەم

## سەردەمی پاڵەوانێتی

ئەم سەردەمە ماوەیەکی زۆر لە مێژین دەگرێتەوە (بە نزیکەیی لە ١٢٠٠ بۆ ١٠٠٠ پ. ز) ئەمەش ئەو ماوەیەیە کە جەنگی تەروادە تێیدا ڕوویداوە و ئەفسانە یۆنانییەکانی تێیدا باو و زاڵ بوون و "هۆمیرۆس" و "هزیود" نوێنەرانی ئەم سەردەمەن[٢٧]. پێگەی ژن لەم سەردەمەدا چی بوو؟ «ڕەوشی ژن ئێجگار خراپ بوو.. خۆ ئەگەر لە ڕەوشی دەرەکی ژنانەوە بڕوانین، ئەوا دەبێ سەردەمی هۆمیرۆس بخەینە خواری خوارەوەی پەیژەی ژیاریی. ژنان لەم سەردەمەدا هیچ مافێکی ئەوتۆیان نەبووە، بەڵکو بە تەواوی ملکەچی باڵادەستی پیاو کراون و لە دڕدۆنگییەکی هەمیشەییدا لەهەمبەر چارەنووسی داهاتوویان ژیاون. ژن لە خێزانە بەرزەکاندا: خاوەنی پێگە و ئەسلزادە و بگرە خانمە ئەمیریش بووە ــ بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا دەیزانی ڕۆژێك لە ڕۆژان پیاوێکی بێگانە دێت و دوور دەیبات، لەبەر ئەم هۆکارە دەکرێت کەنیزەکێك بێت لە ماڵی پیاوێکی تردا»[٢٨]. پیاو لە سەردەمی پاڵەوانێتیدا سەروەر و باڵادەست بووە. نموونە یان نموونەی باڵای ئەم پیاوەش: هێز و جوامێریی و توانای ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنان و پاراستنی ماڵ و خێزانی لە هێرشی ئەوانی تر بووە، لەبەر ئەم هۆیانە باڵاترین فەزیلەت بە پاڵ جوامێریی و دڵڕەقییەوە فەزیلەتی زیرەکی بووە، وشەی فەزیلەتیش لە دەستەواژەی پیاوەتی (Virtus= فەزیلەت و پیاوەتی) و لە ئاریس Ares (خودای جەنگ)ـەوە داتاشراوە. لەو سەردەمەدا پیاوی خاوەن فەزیلەت پیاوی لێبوردە و ئارام و بە ویقار و.. هتد نەبووە، بەڵکو ئەو کەسە بووە کە بە ئازایەتی و تواناوە شەڕی کردووە، کەسی ناقۆڵا کەسێك نەبووە ئالوودەی

شەراب بێت و درۆ بکات و بکوژێت و ستەم بکات، بەڵکو پیاوی ترسنۆك و لاواز بووە[29]، لە سەردەمێکدا کە تێیدا بنەمای زاڵ "هێز هەقە" بووە و تەنیا بازۆڵەی بەهێز هەقی دووپات کردۆتەوە و پشت ئەستووری کردووە ئیدی ڕەوشی خراپی ژنیش دروست بووە،، بۆیە پێویست بووە جەنگاوەری جەسور بەرگری لەوە بکات کە هەیبووە دژی داگیرکەر و دەست درێژان ــ جا شارەکەی بۆیە دووچاری لێدان و تالآن هاتووە چوون خۆیشی شارانی دەرو دراوسێی داگیر و تالآن کردووە.. بەلآم ئەگەر ژنەکەی لەنێو دیلەکاندا بووایە و ببوایەتە شانسی داگیرکەرەکە، ئەوا دەبوو بە لێدانێکی شمشێرەکەی سنوورێکی بۆ ژیانی خۆی دابنایە. تا کاتێکیش ژنان جەنگاوەر نەبوون، ئەوا دەبوو بە تەواوی پشت بە پیاوان ببەستن تا بیان پارێزن، لەبەرامبەر ئەوەشدا دەبوو ئەمانیش ملکەچی پیاوان بن[30]. ڕاستییەکەی هەر کۆمەڵگەیەك بیرۆکەی پاڵەوانێتی بەرز بنرخێنێت و بیکاتە نموونەی بالآ ئیدی زۆربەی هەرە زۆری جاران مامەڵەیەکی خراپ لەگەڵ ژندا ئەکات، لێرەوەشەوە ئەم کۆمەڵگەیە تەنیا ئەو کاتە ژن دەنرخێنێت کە بەتەواوی ڕێی پیاودا بڕوات و ڕێگای ئەو بگرێتە بەر، بۆیەوای لێ دێت پێشوازی لە مەترسی بکات و سڵ لە ڕشتنی خوێن نەکاتەوە[31]. وەك ئەوەی دواتر لە کۆمەڵگەی سپارتەدا دەیبینین.

وێڕای ئەوەش پیاو هەڵگیرسێنەر و دروستکەری شۆڕشیش بووە، ڕاستە چینی کۆیلەکان سەرجەم کارە دەستییەکانیان کردووە و زەوییەکانیان داچاندووە.. بەلآم پیاوی یۆنانی خاوەنی ئەم کۆیلانە بووە، ئینجا هەر ئەویش سەرچاوەکانی سامانی هەبووە، هەر بەم جۆرەش خاوەندارێتییەکەی ژنانیشی گرتۆتەوە. لەمەشەوە هەلومەرجی ژن لە کۆمەڵگەدا پەیوەست بووە بە جۆری خاوەندارێتی باوەوە، لەم سەردەمە پاڵەوانێتییەدا پیاو خاوەنی ژن بووە، و وای لێ کردووە هاوبەشیکردنی لە ژیاندا کورت ببێتەوە لە هەڵسوڕاندنی ماڵ و پەروەردەی منالّدا.

***

پێش کەمێك باسمان کرد کە سەردەمی پاڵەوانێتی سەردەمی ئەفسانە یۆنانییەکان بووە و هەلومەرجی ژن، وەك "زینەفۆن" بۆی دەچێت، ئەو هەلومەرجە بووە کە خواوەندەکان فەرمانیان پێ کردووە، جا دەبێت هەڵوێستەیەك لەسەر ڕەوشی ژن لەم ئەفسانانەدا بکەین، بەتایبەتیش ئەگەر ئەوە بهێنین بە زەینماندا کە یۆنانییەکان دەسەڵات و ڕەگەز و خودا، نێر و مێیان لە یەك شوناسدا یەك خستووە، یان تۆ بڵێ ئەوانە بابەتگەلێك بوون کە لای ئەوان بە توندی پێکەوە بەستراون[٣٢].
هەر لێرەدایە فینلی M. Finley دەڵێت گومانی تیا نییە هۆمیرۆس بە تەواوی مانیفێستی ئەو جیهانبینییە بووە کە لە هەموو جیهانی کۆندا پەسەند کراوە، ئەویش تێڕوانینە لە ژن وەك ئەوەی بە حوکمی سروشت لە پیاو نزمتر و کەمترە، جا بۆیە وەزیفەکەی لە سێکس و وەچەخستنەوە و بە جێگەیاندنی ئەرکەکانی ماڵەوەدا کورت دەبێتەوە، بەڵام ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانەی کە مانا و جۆرێك لە سەنگینییان هەبووە دەبوو بۆ پیاو جێ بهێڵرێن[٣٣].

ئەی کەواتە وێنەی ژن لە ئەفسانە یۆنانییەکاندا چۆن بووە، جا چ لەوانەدا کە هۆمیرۆس یان لەوانەی هزیود ئەیان گێڕنەوە..؟

ڕاستییەکەی ئەفسانە یۆنانییەکان ڕەوشی ئافرەتیان لە ئاسمان هەر بەو جۆرە کێشاوە کە لە سەر زەمین هەیبووە، جا ئایا ئەمە گوزارشتێکی دەستپاکانە نییە لە خەونەکانی مرۆڤ؟ خێزانی خودایی لە چیای ئۆلەمپدا پێکهاتبوو لە زیۆس Zeus و هەر پێنج براکەی و شەش کوڕەکەی و ئینجا کوڕی "هیرا" کە بە تەنیا ناوی خودا "هیفاستۆس Hephaestus"ــی شەلی لێنراوە کە بەر لە کامڵبوونی لەدایك بووە و خواوەندی ئاسن و گڕکانەکان بووە. ئەوەی جێی سەرنجە زیۆس بە حوکمی ئەوەی سەرگەورەی ئەم خێزانە بووە خاوەنی هەموو ماف و جیاوکەکانی "پیاوی یۆنانی" بووە، هاوسەرگیریی لەگەڵ "هیرا Hera"دا – (وشەکە بە واتا حەرفییەکەی واتە خانم کە مێینەی Heros ــی جەناب یان سوارچاکی نێر بووە)، ڕێو ڕەسمی ئەم هاوسەرگیرییە لە سەرزەمینێکی پیرۆز ئەنجام دراوە، پاشانیش "هیرا" بۆتە سەرۆکی

هاوسەرگیریی و خانمی ماڵ کە هاوکاری ژنانی دیکەی کردووە بۆ هاوسەرگیری و لە کاتی سکپڕی و منداڵبووندا پشتیوانی و کۆمەکی کردوون. بەڵام ئەویش خۆی —وەك هەر ژنە مێرددارێکی دیکەی یۆنانی ــ لەگەڵ "زیۆس"ی گەورە خواوەند و سەرۆك خێزان بەدەست ئازار و مەینەتییەکی بێ هەژمارەوە دەیناڵاند، ئەو وێڕای پێگەکەی و شکۆمەندیی تواناکانی کەچی مێردێکی دڵسۆز نەبووە، بۆیە لە خیانەتکردن لە ژنەکەیدا هەستی بە بێزاری و شوورەیی نەکردووە، بەڵکو بە چەندین ڕێگە پەیوەندی لەگەڵ ژنانی دیکە بەرقەرار کردووە جا چ خواوەندان بووبن یان مرۆڤ[٣٤]. پاشان هیراش زۆرینەی کاتەکانی لە چاودێریکردنی ئەودا بەسەر بردووە، ئەمەش بۆ دەرخستنی خیانەکانی و لەسەر گرتن، تۆڵەسەندنەوە لە عەشیقەکانی، بە چاوپۆشی و پشت گوێخستنی ئەو تکا و رجایانەی کە بۆ پاساودانەوەی کارەکانیان دەیان هێنانەوە. بەڵام توانای خواوەندانەی زیۆس بۆ خۆ ونکردن و هەندێکجار خۆ خستنە شێوەی ئادەمیزاد و هەندێجاریش ئاژەڵان، سەختی ئەرکەکەی هیرای چەند بارە قورستر دەکرد، ئەمەش وای کرد دەرخستنی کارەکانی و ئاشکراکردنی شێوازەکانی زیۆس کاری نەکردە بێت. زیۆس تەنیا بە خیانەتەوە نەوەستا بەڵکو هاوسەرگیری دیکەیشی کردبوو، ئەمەش بووە مایەی ئیرەییەکی زۆر لە دڵی هاوسەرە دڵسۆزەکەیدا، بۆیە هەوڵی خۆی تەرخانکرد بۆ لەنێوبردنی ژن و منداڵەکانی تری زیۆس، جا زیۆس پەنای برد بۆ خستنەوەی "ئەسینا"ی کچی لە سەرییەوە بە بێ هیچ پەیوەندییەکی سێکسی، لەبەرئەمە تووڕەیی مێشکی ژنە شەرعییەکەی گرت، لەداخان ئەویش لای خۆیەوە هەوڵیدا بۆ وەچەخستنەوە بە بێ هاوکاری ئەو. لێرەدا دەبینین هیرا هەرگیز هەوڵی نەداوە خیانەت لە زیۆس بکات، ئەو وەك ژنێکی دڵسۆز و خواژنی "هاوسەرگیریی"، بۆی گونجاو نەبووە پێخەوی هاوسەرگیریی پیس بکات جا مێرەکەی هەرچییەکیشی کردبێت (هەر لەبەر ئەمەیشە هیرا نموونەی باڵای هاوسەری یۆنانییە). لەبەرئەوە دەبینین لە کۆبوونەوەی نەمرە خواوەندەکاندا وەك هەر ژنێکی تری دڵسۆز کە خیانەتی مێردەکەی تەنگی پێ هەڵچنیبێت بە تووڕەیی هاوار دەکات: «ئەی

خواوەندان گوێم بۆ ڕادێرن، ببینن زیۆس چۆن تووشی عەیب و عاری کردووم، دوای ئەوەی بوومە ژنی، یەکەمجار ئەو، واتە زیۆس، ئەو کار و کردەوە قێزەونەی کرد! ئەی دڕندەی سەرچەوت، چۆن وێرات ئەسینات ببیٚ؟ ئایا من نەمدەتوانی منداڵێکم لێت ببیٚ؟ ئەی من ژنی تۆ نیم؟ منیش لە ئێستە بەدوا هەوڵدەدەم کوڕێکم ببێت کە لەنێو خواوەندەکاندا مرواری و گەوهەر بیٚ، ئەو کارەش دەکەم بیٚ ئەوەی پێخەوەکەم یان جێی نووستنم پیس بکەم، ئیتر لەمەودوا پەیوەندیم پێتەوە نامێنێت. بەڵام لات نامێنمەوە»[٣٥].

هەروەها میتۆلۆژیای یۆنانی دەگێڕێتەوە هەر "زیۆس" بووە "هاوڕەگەزبازیی" هێناوەتە نێو یۆنانەوە، "هیبە Hebe"ی کچە جوانەکەی خواژنی لاوێتی و گەنجی، کچە ساقییەك لای ئیشی ئەکرد و جامەکانی بۆ هەڵدەگرت، کاتێك شووی بە هرقل کرد زیۆس ناچار بوو بە دوای هاومێزێکی تردا بگەڕێت، بۆیە خۆی خستە شێوەی هەڵۆیەك و بەسەر زەوییەکان و قەڵەمڕەوییەکەیدا دەفڕی و دەسوڕایەوە تا چاوی بە سەردارێکی جوان بەناوی "گانیمێدیس Ganymedes"، شازادەی تەڕوادە کەوت، شازادە لەسەر گردێك لێی خەوتبوو و جوانی لە ڕەوخسارییەوە پەخش ئەبوویەوە، ئەویش وەخەبەری هێنا و هەڵیگرت و بردی بۆ ئۆلەمپ و کردییە هاومێز و هاوەڵی خۆی، لەبەرامبەر ئەوەیشدا کۆمەڵێك ئەسپی ڕەسەنی بە باوکی دا[٣٦].

بە کورتی "زیۆس" لەپاڵ ژنە شەرعییەکەیدا ژمارەیەك دۆستی هەبووە کە وەك "حەرەمسەرا"کەی وا بوون. بەڵام پیاوێکی خیانەتکار بووە لە بەرامبەر بەڵێنی هاوسەرگیریی بیٚ ئەوەی ئومێدی چاکبوونیشی لیٚ بکرێت. بۆیە هیچ شتێکی بۆ نەمایەوە لەبەرامبەر ژنەکەیدا جگە لە خۆ بەدەستەوەدان. ئەمەش ڕێك لەسەر زەمین ڕوویدا و گریکەکان لەو گەلانە بوون کە مومارەسەی تاکە ژنییان کردووە، واتە بڕوایان بەهاوسەرایەتی یەك ژنی شەرعی هەبووە. بەڵام دەروەستی لادانی مێردەکان نەبوون و چاوپۆشییان لەو پەیوەندییە ناشەرعییە زۆرانە کردووە کە پیاو مومارەسەی کردووە. لە ڕووی پرەنسیپەوە باوك خاوەنی دەسەڵاتی باڵاَ و هەر هاوسەرینێك بوو کە

ویستبای و ئەمانە پێشکەشی میوانانیش ئەکران و منداڵەکانیشیان لەسەر لوتکەی شاخ دادەنران تا دەمردن یان دەکرانە قوربانی بۆ خواوەندەکان[٣٧].

ئەوەی بۆ "زیۆس"ـی گەورە خواوەند ڕاستە بۆ سەرجەم خواوەندەکانی دیکەیش دروستە، "بۆزیدون"ـی خواوەندی دەریا، وەك "زیۆس"ـی برای ژندار بوو، یان چەند دۆستێکی هەبوو، هاوسەرگیریی زۆری لەگەڵ بوك و پەرییەکانی دەریا و کانییەکاندا..هتد کردبوو و منداڵی زۆری پێ خستبوونەوە کە لە ئەفسانەکاندا ڕۆڵی گرنگیان گێڕاوە، وەك ئەوەی "تریتۆن Triton" کوڕە سەرکەش و شەهوەتباز و لاقەکەری ژنان و نۆکەرە لوسکەلەکان دەیکرد.

کەواتە لە میتۆلۆژیای یۆنانیدا، ژن لاواز و ژێردەستی فەرمانداره‌کەی بووە، مافێکی ئەوتۆی نەبووە تەنانەت ئەگەر خواوەندیش بووبێت، کتومت وەك ژن لە کۆمەڵگەی یۆنانیدا. خۆ ئەگەرچی ئەم ترادسیۆنە ئەفسانەییە باس لە دوو جۆری ژنە خواوەند دەکات:

یەکەم: خواوەندانێك کە یەکجار بەم ڕادەیەش لاواز و بێ دەسەڵات نەبوون، بەڵکو ڕێزدار و بە شان و شکۆ بوون. بە تایبەتیش سێ ژنە خواوەند "ئەسینا" و "هیستیا" و "ئارتەمیس"، ئەمانە پاکیزە بوون و لە هەموو بارێکدا ڕەتیان کردۆتەوە هاوسەرگیریی بکەن. یەکەمیان بووە شوانی کار و پیشە دەستییەکان بەتایبەتیش چنین و ڕستنی پەمو و خاوکردنەوەی، بەشێوەیەکی گشتیش کارە ژنانەکان). دووەمیان بووە خواژنی ئەو کوورە ئاگرەی کە پاراستن و بەردەوامی بە ئاگرەکە دا بۆ ئەو کەسانەی داوای یارمەتی لە کورەی پیرۆزی ماڵ دەکەن تا کۆرپەی تازە لەدایکبووی لە ڕۆژی پێنجەمی لەدایکبوونیدا بە دەوردا بسوڕێننەوە بۆ ئەوەی وەك ئەندامی خێزانەکە دانی پێدا بنرێت. بەڵام "ئارتەمیس" خواژنی ئەو ئاژەڵە گچکانە بوو کە گچکەکانی لە هەموو جۆرەکان پاراست و لە بنیادەمیش وەچەیان خستۆتەوە. لەبەر ئەمە ناوی نراوە "خواژنی دایك"، کەواتە ئەو "قەیرەکچ"ـی بنەماڵەی پایەبەرزی خواوەندان بووە. تێبینییەکی دیکە هەیە ئەویش ئەوەیە وشەی

"خواوەند" لە میتۆلۆژیای یۆنانیدا بە ناچاری دەلالەت نییە بۆ سەرجەم ئەو خەسڵەتانەی کە بە زۆریی دەدرێنە پاڵ مێینەیی مرۆڤایەتی، بۆ نموونە گەورەترین خواژنی پایەبەرز کە ئەسینای خواژن بووە لەبەر ئەو سیفەتە "پیاوانانە"ی کە هەیبووە ستایش کراوە[٣٨]. ئەمەش لە هزری ئەفلاتوندا ڕەنگی داوەتەوە وەك ئەوەی لە دیالۆگی خوان-دا (١٨١ أ ـــ حـ) ڕون دەبێتەوە، دواتریش دێینەوە سەر ئەم بابەتە.

ئێستا هێندە بەسەر باس لە چیرۆکی لەدایکبوونی "ئەسینا" بکەین لە سەری "زیۆس"ـەوە کاتێك هەستی بە سەرئێشەیەکی توندی وەها کرد خەریك بوو سەری ناڵە بکات[٣٩]. "هیفاستۆس"ـی خواوەند تەورێکی خواوەندانەی کێشا بە سەریدا و سەری قاژ کرد و ئەسینا، بە زرێپۆشی، لێوەی هاتە دەرەوە و چەشنە هاوارێکی جەنگی کرد کە ئاسمان و زەمینی ڕاوەشاند و خواوندەکانیشی داچڵەکاند و چیای ئۆلەمپیشی هێنایە لەرزین و دەریای تووشی هەڵکشان و داکشان کرد[٤٠]. بۆیە "ئەسینا" ژنێکی ناسك نەبوو، بەڵکە ئەو سوارچاکە جەنگاوەر یان پاڵەوانە بوو کە نموونەی باڵای پیاو بووە لەو سەردەمەدا. ئێمە پێمان وایە ئەمە ڕاڤەی دروستی پێگەی ژنە لە ئەفسانە یۆنانییەکاندا، ئەوەیش پێگەیەکە کە زۆر دوور نییە لە پێگەی ژن لە دنیای خەڵکیدا، لێرەشەوە کەسانێك کەوتوونەتە هەڵەی بەڵگەگیریی ئەوەی کە پێگەی ژنی یۆنانی بەو جۆرە بووە کە لە ئەفسانەکاندا هەبووە یان دەڵێن «ئەوەی وێنە هەڵکۆڵراوەکانی لە پارتینۆن Parthenon بینی بێت هەست بە ڕەگەزی مێیینەیی دەکات نەك تەنیا لە ئەفسانەکاندا بەڵکو لە ئایینەکانیشدا، جێی باسیشە ئەسیناییەکان ئەسینای خواژنیان کردووە بە چاودێر و پارێزەر و ڕەمزی شارەکەیان»[٤١]. وەها بەڵگەگیرییەك کە «ژنی ئەسینایی برێکی فەرامۆشکراو و پشت گوێخراو نەبووە» هەڵەیەکی زەقە.

جۆری دووەمی ژنان لە کۆمەڵەی خواوەندە نەمرەکاندا "ئەفرۆدێت"ـی کچ یان دۆستی زیۆس دەینوێنێتەوە، ئەو چاودێری گۆرانیبێژانی ئەسینا بووە، وەك هزیودیش دەیگێڕێتەوە تەنانەت جۆری لەدایك بوونیشی سێکسییانە بووە، ئەویش ئەو

کاتەی"ئۆرانۆس"ی خواوەندی ئاسمان لەلایەن نەوەکانییەوە پارچە پارچەکرا زێی دەریا تێهەڵکێش بە پارچەی چووکی بوو، بۆیە ئەفرۆدێت بە ڕووتی و پێگەیشتوویی لە دەریاوە هاتە دەرەوە، واش پێدەچێت ئەم "ئەفرۆدێت"ـە هەر "عەشتاروت"ـی ڕۆژهەڵات بێت، خواژنی پیت و بەرەکەت (بۆ زەوی و ژنیش) و خواژنی خۆشەویستی کە لە ژیانی ڕوەکەکانی زەوی و سێکسی ژندا هێما بووە بۆ سوڕی سروشت، هەروەها هێمای بەردەوامیی ژیان بووە لەڕێگەی زاوزێ و خواژنی هەوا گۆڕین بووە و دۆستانێکی زۆریشی هەبووە[٤٢]. ئەگەرچی ئەفلاتون پێی وایە دوو جۆری "ئەفرۆدێت" هەیە: یەکێکیان ئاسمانی و ئەوی دیکەیشیان زەمینی، وەك دواتر دەبینین یەکەمیان دەنرخێنێ و دووەمیشیان ڕەت دەکاتەوە.

"ئەفرۆدێت" لە ئاسمان خواژنی گەمەکان بووە. لەبەرئەمە خواژنی سێکس و بەدڕەوشتیی پیرۆزیش بووە و چیرۆکیشی دوایی نایەت. بەڵام لە زەمین شاری ئەسینا "کردەییانە" دان بەم خواژنەدا دەنێت و دەوڵەتیش بە ڕەسمی بڕیاری بەدڕەوشتیی (داوێنپیسی) دەردەکات و باج دەخاتە سەر بەدڕەوشتان کە بە زۆریی لەو ژنە بیانییانە بوون کە وەك سەرچاوەی ڕزق و دەستگەیشتن بە گەورەپیاوانی ئەو گەلە لە شارەکەدا مومارسەی ئەم پیشەیەیان کردووە. لێرەوە لەشفرۆشی لە ئەسینا و زۆربەی شارە یۆنانییەکاندا، بووە پیشەیەکی زۆر بە برەو[٤٣].

ئەوەندە ماوە بە هاتنەخوارەوەی ئەفرۆدێت لە ئاسمانەوە بۆ زەمین، لە خواوەندەوە بۆ مرۆڤ، و چۆنیەتی پەیوەندی نێوانیان، کۆتایی بەم بەشە بهێنین، چۆن خواوەند لە مرۆڤەوە دەخولقێت؟ هزیود لە "کارەکان و ڕۆژەکان" (بەیتەکانی ٥٤-١٠٥) و "ڕەچەڵەکی خواکان" (٥٢١ ــ ٦١٦) ــدا بۆمانی دەگێڕێتەوە کە "پرۆمیسیوس Prometheus" (مانای حەرفییانەی وشەکە واتە بینا یان بینەر) پیاوی ئافەریدە کردووە «پیاوانێکی زۆری ئافەریدە کرد و لەسەر گردێکی بەرز لێی دانیشت بۆ سەرپەرشتیکردنی بەندە باشەکانی.. پاشان بیری لەوە کردەوە نیعمەتێکیان بۆ

بنێرێت.. ئیدی لە کاتی غەفڵەتی زیۆسدا ئاگری پیرۆزی دزی، بۆیە گەورەی خواوەندان لێی پەست بوو و بە تەوق و کۆتکردن سزای دا»..[٤٤].

دەبوو پیاوانیش سزای خۆیان وەربگرن، بۆیە ئەویش ئافرەتی بۆ ئافراندن و ئەفرۆدێت هەندێك لە جوانی خۆی پێدا و ئەسیناش کارەکانی ناو ماڵ و چنینی فەرووی فێرکرد، ئەم یەکەم ژنەیش "پاندۆرا Pandore" بوو (مانای حەرفییانەی وشەکە واتە بەخشش یان دیاریی هەمەگیر)، ئەفسانەکە دەڵێت "هورمز"ی پێغەمبەری خوداکان تەوق و کۆتەکانی پرۆمیسوسی پێ هەڵگرت، بەڵام ئەو ڕەتیکردنەوە چونکە "بینەر" بوو ــ بۆیە شووی بە "ئیپیمێسیوس Epimetheus" (واتە بزێو یان چرپن)ـی برای ئەو کرد.

بەم جۆرە دەبینین "هزیود" بینا ــ پرۆمیسیوس-ـی خواوەند دەکاتە ئەفرێنەری پیاو و هیفاستیوسی گۆجی شێواویش ئەکاتە ئافرێنەری ژنان[٤٥]. هەروەها هزیود پێی وایە پیاو لە بەهەشتێکی بەرداردا دەژی، نە کار دەکات و نە تووشی نەخۆشی ئەبێت، ئەمەش سەردەمی زێڕین بووە و لەو ڕۆژگارە دەچێت ئادەم بەر لە ناسینی حەوا لە بەهەشتدا بەسەری بردووە. دوای دزینی ئاگر﴾لەلایەن پرۆمیسیۆسەوە﴿ "زیۆس" چوار وەرزەکەی دروست کرد، ئیدی زەمەن وەك جاران هەمیشە بەهار نەبوو، بۆیە پیاو چووە سەردەمی زیوینەوە، بەڵام بە هاتنی پاندۆرای ژن بۆ سەر زەمین بەهۆی ئەو خێو و تارماییانەوە کە لەگەڵی هاتبوون سەردەمی مسین دەستی پێکرد: نەخۆشی و دەرد و ئافەتی هەژاری کە سەرجەمیان لە سندوقێکەوە هاتنە دەری[٤٦]. ئیدی ئەمە زەمینی پڕ کرد لە چەندین جۆری تەنگوچەڵەمە، ئینجا موسیبەت و دەردەسەری زۆر بوون بۆیە ئەمەش چووە سەردەمی ئاسنینەوە و ئیدی گوناه و تاوان چوونە دەروونی خەڵکییەوە و دەستیان کرد بە هەڵپە هەڵپی ڕزق و بژێوی و کوشتن و بڕی یەکتری[٤٧].

هزیود بۆچوونی خۆی لەبارەی ژنەوە وەها پوختە دەکاتەوە کە: «ڕەگەزی ژنی نەرم و نیان لە پاندۆراوە هاتوون، ئەو ڕەگەزە پیسەی کە خراپەیەکە پەرش و

بڵاوبۆتەوە و تووشی پیاوان دەبێت، ژن هاوڕێی ژیان نییە کە لە هەژاری و ئازارەکاندا هاوبەشیی مێردەکەی بکات، بەڵکو هەر داوای خواردن و پۆشاك ئەکات و چاوچنۆکییەکەیشی لە سنوورێکدا ڕا ناوەستێت، بەم جۆرە زیۆس ژنی دروست کرد تا ببێتە سەرچاوەی خراپە و دارِزان»[٤٨]. خۆ ئەگەر ئەو وێنەیەی هزیود نیگاری کردووە وێنەیەکی تاریك بێت لای هۆمیرۆسی هاوشێوەی[٤٩]، ئەوا لەوانیتر گرنگترە ـــ ئەوەش لەبەرئەوەی هۆمیرۆس لە کۆشك و تەلاری پاشا و ئەمیرەکاندا هۆنیویەتییەوە و تەنیا قسەی بۆ خانەدانەکان کرووە.. بەڵام هزیود بۆ خەڵکی ڕەشۆکی و عەوام، واتە بۆ جەماوەری سادەی خەڵك دواوە و زمانێکی بەکارهێناوە کە لەگەڵیاندا بگونجێت، بگرە کتێبی "کارەکان و ڕۆژەکان"ی بۆ جوتیارانێکی وەك خۆی نووسیوە، بۆ ئەوەی ئامۆژگارییەکانی پێیان بگات و ژیانی پڕ نەداری و دەردەسەری و کولەمەرگییان پەسن بدات کە خەڵکی ڕەشۆك بە دەستییەوە ناڵاندوویانە، ئەمەش وای کردووە زیاتر میللییانە بێت و هزرەکانی لەنێو جەماوەرێکی بەرفراواندا برەوی پێ بدرێت و لەبارەیەوە بنوسرێت و زۆرێکیش لە فەیلەسوفان بکەونە ژێر کاریگەری.

## بەشی دووەم

## سەردەمی کلاسیکی

مەبەستمان لە سەردەمی کلاسیکی ئەو قۆناغەیە کە ئەسینا و سپارتە — کە دوو بەهێزترین شاری یۆنانی بوون تێیدا گەشەیان سەند، بە جۆرێك کە سپارتە گەیشتە لوتکەی شان و شکۆی سەربازیی خۆی و ئەسیناش لە سەردەمی زێڕینی خۆیدا دەژیا لە بواری کولتووری و هونەر و ئەدەبیاتەوە، وا پێدەچێت ئەم سەردەمەش سێ سەدە درێژەی کێشا بێت (لە کۆتایی سەدەی حەوتەمەوە هەتا کۆتایی سەدەی چوارەمی پێش زاین) و لەو ماوەیەدا شەڕی گەرم لەنێوان ئەم دوو دەوڵەتە گەورەیەدا ڕوویداوە. دیارە یۆنانییەکان ئەگەر و توانای بوونی یەك دەستوری سیاسی ئەوتۆ کە بتوانێت بگاتە دەرەوەی جوغزی شارەکان بە هزر و هۆشیاندا نەهاتووە. هەر شارێك دەستوورێکی تایبەتی خۆی هەبووە کە پەیوەندییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان و پەیوەندییەکانی ئەو شارەی لەگەڵ دەر و جیرانەکان ڕێك دەخست.. هتد. لێرەدا ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە ئەوەیە ڕەوشی ژن لە ئەسینای وەختی ئەفلاتوندا بخەینە ڕوو کە لەو شارە لەدایك بووە و ژیانی تێدا بەسەر بردووە و قوتابخانەکەی تێدا دامەزراندووە و هزرەکانی خۆیی ڕێك خستووە. هەروەها پێگەی ژن لە سپارتەیش پیشان دەدەین کە کاریگەری بەسەر فەیلەسوفەکەمانەوە هەبووە و بگرە دەشڵێن زۆرینەی بیروباوەڕە جەسوورەکانی لەبارەی ژنەوە لەوێوە وەرگرتووە و گواستووەتەوە.

### یەکەم: ژن لە ئەسینادا:

دۆخی ئافرەت لە سەردەمی کلاسیکیدا زۆر باشتر نەبوو لە سەردەمی پاڵەوانێتی و بگرە لە ئەسینای خاوەن شارستانێتی گەشەسەندوویشدا، وەزیفەی سەرەکی ژنی

"ئازاد" هەر بەڕێوەبردنی ماڵ و پەروەردەی منداڵ بوو. مەبەستیشمان لە ژنی "ئازاد" هاونیشتمانی ڕەسەنی ئەسینییە، چونکە ئێمە دەبینین لە ئەسینای ئەو سەردەمەدا، جگە لە کەنیزەکەکان، دوو جۆر لە ژنان هەبوون: جۆری یەکەمیان زۆر بە دەگمەن هەنگاو بنێتە دەرەوەی دیواری ماڵەکەی، ئەم جۆرە بە هەموو کۆت و بەندەکان تەوق کرا بوو، ئەمەش پێکهاتبوو لە ژنە ئەسینایییە "ئازادەکان" لەمەشدا پارادۆکس هەیە!! بەڵام گروپی دووەمیان ژنە بیانییەکان بوون، ئەمانە هیچ کۆت و بەندێکیان نەبوو، لە هەر کاتێکدا بیانویستبا بە ئارەزووی خۆیان دەچوونە دەرەوە و هەر کارێکیان بە گونجاو زانیبا دەیان کرد. ئای گروپی ژنە ئازادەکان چەندە ئیرەییان بەم ئازادییەی ژنە بیانییەکان دەبرد!. ئێستا دەبێت چەند وشەیەکی کورت لەبارەی هەر گروپێکەوە بڵێین بۆ ئەوەی لە پێکهاتەی کۆمەڵگەی ئەسینایی و دۆخی ژن تێیدا، تیێ بگەین.

**١- هاونیشتمانی ئەسینایی:**

ئەگەرچی ئەسینا ژمارەی دانیشتوانەکەی لە سی هەزار هاونیشتمانی تێ نەدەپەڕی کەچی گەورەترین شاری یۆنانی بوو، بیرۆکەی باو و بڵاو ئەوەبوو کە هەموو ئەم هاونیشتمانییانە "پەیوەندیی خوێنی" بە یەکییانەوە دەبەستێتەوە، هەر هەموویان سەر بە یەك بنچینەی خودایین، مافگەلێکی زۆری سیاسی و کۆمەڵایەتییان هەیە و خاوەنی موڵك و ماڵی تایبەتین.. هتد. پاشانیش ئەوەی بۆ بەردەوامێتی شارەکە گرنگ بوو هێشتنەوەی بنەچەکەیان بوو بە "پاکی" بۆ ئەوەی ئەم ماف و جیاوکانە بۆ کەسانی بیانی دزەیان پیێ نەکرێت. لەبەرئەمە پرەنسیپی گشتی ئەوە بوو کە هیچ کەسێك نابێتە خاوەنی مافی هاونیشتمانێتی ئەگەر دایك و باوکی هاونیشتمانی ئەسینایی نەبووبن، ئەم مافانە لە "موڵکایەتی مەعنەوی" دەچوو کە باوك دەیویست، بە پاڵ موڵك و ماڵەکانی تری وەك خانوو و زەوییەوە، بۆ کوڕەکانی لە پشتی خۆی بگوازێتەوە..هتد، هەر بەم جۆرە ئەم کۆمەڵگە باوکسالارە

بایەخێکی گەورەی دا بە خیانەتی ژن، بۆ ئەوەی بنەچەی بێگانە و نارەسەن نەیەنە ناوەوە و دەستدرێژی بکەنە سەر مافی هاونیشتمانی ئەسینایی، هەروەها دەسەڵاتێکی بەرفراوان بە باوکیش درابوو، هەر ئەو بوو بە مانای تەواوی وشەکە "خاوەنی خێزان"ـەکە بوو، بۆ نموونە مافی خۆی بوو بۆ دانەوەی قەرزێك کە لە ئەستۆی بوو، یاخود بۆ ئەوەی سوود لە نرخ و بەهاکەیان وەربگرێت هەر یەکێك لە نەوەکانی بفرۆشێت –جا کوڕ بووایە یان کچ-. ئەگەرچی یاساکانی "سۆلۆن" ئەم مافەی لە باوکەکان سەندەوە، کەچی ئەو یاسایانە لە دەروونی خەڵکی یۆناندا جێی خۆی نەگرت. بۆیە دواتر دەبینین چۆن ئەم موڵکایەتییە کاریگەری لەسەر تێگەیشتنی ئەفلاتوون لە خێزان هەبووە و چۆنیش لە دیالۆگی "یاساکان"ـدا ئەو مافەی بە باوك داوە کە دەست لە نەوەکانی هەڵبگرێت بۆ خەڵکانی تر! کاتێکیش متمانەیەکی کۆنکرێتی بە ژنان نەکراوە ئیدی ڕۆڵی وایان پێ سپێردراوە کە لە چاوی پیاوان دووریان بخاتەوە.

ژنی ئەسینایی هیچ پەیوەندییەکی بە پیاوانە نەبوو، ژیانی گشتی لە ڕێ و بانە یۆنانییەکان و شوێنەکانی کۆبوونەوەدا تایبەت بە نێرینە بوون. بازاڕەکان و نادییە وەرزشییەکان و کۆمەڵەکان شوێنگەلێك بوون کە پیاو و پیاو تێیاندا یەکتریان دەبینی. ڕاستییەکەی ئەو شارە یۆنانییە لە هەموو ڕوویەکەوە لە "یانەی پیاوان" دەچوو[٥٠]. لای یۆنانییەکان ڕێ نەدەدرا ژن هاوبەشی خۆی بۆ سێکس هەڵبژێرێت (ئەم دۆخەش لای پاسەوانەکانی ئەفلاتون دەبینینەوە کە هاوبەش و هاوڕازی خۆیان هەڵنابژێرن بەڵکو تیروپشکێکی خۆوبەخت دەبەسترێت بۆ لێك نزیکبوونەوەیەکی کاتی).. هەروەها هەمان بارودۆخ لە هاوسەرگیریشدا هەبوو کە بنەماڵەکە دەیان سەپاند و زۆربەی جاریش ئەو پیرێژنانەی کە ڕێیان پێ دەدرا لە ماڵێکەوە بچنە ماڵێکی تر، ئەم بۆنەیەیان ڕێك دەخست.

بە گشتی کچ لە تەمەنی پازدە و شازدەساڵیدا شووی بە گەنجێکی سی ساڵ دەکرد، واتە دوو هێندەی تەمەنی خۆی (لای ئەفلاتون و ئەرستۆش ئەمە تەمەنی

گونجاو بوو بۆ هاوسەرگیریی) ئەمەش دەبووە هۆی هەڵکەندنی خەرەندێکی قووڵ لەنێوان ژن و پیاوەکەدا. نە لە ڕووی ساڵی تەمەنەوە و نە لە ڕوی پێگەیشتنی عەقلییەوە و نە لە بواری گرنگیدان بە کاروبارەکانی ژیانی گشتییەوە لێك نزیك نەبوون..هتد. پارادۆکسە سەیرەکە لەوەدایە هیچ ئاستێکی ڕۆشنبیریی ئەو کچەی کە دەیویست هاوسەرگیریی بکات بە مەرج وەرنەدەگیرا، تەنانەت لە چینە بەرزەکانیشدا. خۆ ئەگەر کچەکە شوو بکات ئەوا کۆمەڵێك ئەرکی دەکەوێتە ئەستۆ و پێش هەموو شتێکیش گرنگیدان بە ماڵ.

"زەینەفۆن" دەڵێت: «وەك چۆن شاژنی هەنگ لە شانەی هەنگوینەکەدا دەمێنێتەوە و سەرپەرشتی هەنگە ئەندامەکانی تر دەکات و خۆیشی ئیش ئەکات، هەر بەم جۆرەش دەبێت ژنی سەرپەرشتیاری ماڵ (کەیبانوو) لە نێو ماڵەکەدا بمێنێتەوە و سەرپەرشتی کارەکانی تر بکات، چاودێریی مەسروفاتی ماڵ بکات و خەرجی ساڵێك نەکات بە خەرجی مانگێك ــ و ئەو کچانەی تر کە ئەزموونێکی ئەوتۆیان نییە بتوێنێتەوە، مەبەستیش لەمانە کەنیزەکە نەخۆشەکانن..هتد»[٥١]. خۆ ئەگەر چووە سەر ڕێ و بان پێویستە خۆی داپۆشێت ــ ئەوەش فەرزێکە تەنیا لەسەر ژنی ئازاد و کەنیزەك و بیانییەکان ناگرێتەوە، وەك بڵێی ئەو پەردە ڕوخسارگرەی دەیگرێت بە ڕووی خۆیدا بریتییە لە نیشاندانی ئەوەی کە ئەم خانمە "موڵکی تایبەتە" و نابێت توخنی بکەون! بەڵام کەنیزەك و لەشفرۆشەکان موڵکی گشتین!! "لارۆس" لەژێر وشەی پەردەی ڕوخسارگردا دەڵێت «ژنەکانی یۆنان ئەگەر بچوونایەتە دەرێ ڕوخسارگریان بەکار دەهێنا و وەك ئەوەی لای گەلانی ڕۆژهەڵاتی دەیبینین ڕوخساری خۆیانیان بە لایەکی دادەپۆشی[٥٢]، هەروەها ژن لە سەدەکانی ناوەڕاستیشدا ڕوخسارگری بەکارهێناوە»[٥٣]. لەمەش زیاتر لە ئەسینادا ئەرکی ژن بوو کە وەفادار و بە ئەمەك بێت و سزای سەختی ژنانی خیانەتکاریش دەدرا، ئەو تەنیا بە شووکردنی ئیتر ڕێی ئەوەی پێنەدەدرا ئەڵتەرناتیڤێکی دیکەی سێکسی بۆ خۆی بدۆزێتەوە، بەڵکو دەبوو بە تەواوی پشت بە مێردەکەی ببەستێت، ئەمە لە کاتێکدا مێردەکەی

کۆمەڵێك ئەڵتەرناتیڤی سێکسییانەی دیکەی هەبوو (وەکو لەشفرۆشەکان و هاوڕەگەزبازەکان..هتد).

یۆربیدس لە شانۆگەری میدیادا دەڵێت: «ئەگەر پیاو لە هاوسەری ژیانی بێزار بوو، لە ماڵ دەچێتە دەرەوە و کۆتایی بە پەستی و بێ تاقەتی خۆی دێنێ و ڕوو دەکاتە هاوڕێ یان برادەرێکی هاوتەمەنی خۆی. بەڵام ئێمە مەجبورین تەنیا چاومان لە کەرەمی پیاوەکان بێت»!! (بەیتەکانی ٢٤٥)

تەنانەت ئەگەر پیاوەکەش بمرێت پێویستە ژنەکە جلّەوی خۆی و جەستەی خۆی بکات، لەبەرئەوەی دیسان دەگەڕێتەوە بۆ ئەستۆی باوکی یان پاسەوانەکەی کە بە دەستی ئەوە جارێکی تریش بیداتەوە بە کەسێك بە ئارەزووی خۆی. بەڵکو هاونیشتمانی توانیویەتی خوشکی خۆی یان کچی خۆی لەبری بە شوودانیان لەپێناو پیاوەتیدا وەك کەسی خاوەن ناو و ناوبانگ بکاتە دیاری و ڕەنگە ئەویش بێ هیچ دڵگرانییەکی خاوەنەکەی ناردبای بۆ ماڵێك لە ماڵەکانی لەشفرۆشی[٥٤]. مافی ژنەکەیش نەبوو چاوەڕوانی دڵسۆزییەکی هەمیشەیی بێت لە مێردەکەی. سۆفۆکلیس لە زمانی دیانێرا Dejania وە ئەڵێت: «ئەگەر ژنەکەی من لەبەرئەوەی تووشی پەژارەی خۆشەویستی هاتووە سەرشێت ببێت ئەوا من هۆشم لای خۆم نامێنێت».[٥٥].
ئەم جۆرە ئارامگرتنە تەنیا لە وتەی شاعیرەکاندا نەبووە، بەڵکو لە لە زەینی ژنەکانیشدا چەسپاوە وەك بەشێك لە بەشەکانی لە ئەو ئەرکانەی بەسەریاندا سەپێنراوە، ئەمەش هەر ئەوەیە کە ژنێکی فیساگۆری گوزارشتی لێ کردووە و گوتوویەتی: «ئەرکی ژنە هەموو بار و ڕەوشێکی مێردەکەی قەبووڵ بکات، جا کڵۆڵ و کەساسێکی بەد بەخت بێت، یان لە نەزانییەوە خراپە بکات یان تووشی نەخۆشی ببێت، یاخود ئالوودەی خواردنەوە بێت و یان لەگەڵ ژنانی ترا سەرجێیی بکات، چونکە ئەم جۆرە هەڵانە بۆ مێردەکان ڕێ پێدراون، بەڵام بۆ ژنەکان ڕێ پێ نەدراون و خۆ ئەگەر ئەنجامیشیان بدەن ئەوا سزا چاوەڕێیانە»..[٥٦].

ئەم پێوەرە دوو فاقییە لە وشەی "زینا"ی یۆنانییشدا ئاشکرایە، کە بە مانای ئەوەیە ژنێکی مێردداری سەرجێیی لەگەڵ پیاوێکی تری جگە لە مێردەکەیدا بکات، ئەم ژنە خیانەتکارەش بە سزای سەخت سزا دەدرێت[٥٧]. هۆکارەکە ڕوونە: ئەنجامدانی خراپە و داوێنپیسی لەلایەن ژنەوە بنەچەی هاونیشتمانی پیس ئەکات و ئینجا وا لەو منداڵانە ئەکات کە دەبنە میراتگری هەم مادی و هەم مەعنەوی باوکیان لە پشتی ئەو نەبن، ئەمە لەکاتێکدا داوێنپیسیی مێردەکە نابێتە هۆی ئەم بەرەنجامە. "دیمۆستین" ئەم لێك جیاکردنەوەیە ڕوون دەکاتەوە کە دەڵێت: «ئەوەی لەگەڵ ژنێکدا بژی و بیکاتە هاوسەری خۆی، ئەوا دەیەوێت منداڵی لێی هەبێت، منداڵەکانیشی ئەندام بن لە خێڵێك یان هەر یەکەیەکی دیکەی کارگێڕیی لە ئەسینادا، ئێمە لەشفرۆشەکانمان بۆ چێژ دەوێن، دۆستەکانیشمان بۆ تەندروستی ڕۆژانەی جەستەمان، بەڵام هاوسەرەکانمان بۆ ئەوە دەوێن کە منداڵی شەرعیمان بۆ بخەنەوە و بە ئەمانەت و دڵسۆزییەوە بایەخ بە ماڵەکانمان بدەن»..[٥٨].

بەم جۆرە دەبینین بەهای ئەو ژنانەی لە سەردەمی ئەفلاتوندا بۆ هاوسەرگیریی هەڵدەبژێردران لەوەدابوو کە پاکداوێن و هەڵسوڕێنەر و بێدەنگ بن و ئیدی ئەم بەهایە بە هیچ واتایەك لە کەسایەتی خۆیانەوە هەڵنەدەقوڵا. زۆر بەڵگە هەن لەسەر ئەوەی ڕەوشی ژن لە ئەسینادا لە هەموو چینەکاندا وەك یەك بووە، تەنانەت کچانی چینە بەرزەکانیش کارەکانیان لە یەك وەزیفەدا چڕ دەبوویەوە ئەویش ئەوەی کە هاوسەری بە ئەمەك و هەڵسوڕێنەر بن و هیچ بایەخیش نەدەن بەو بوارانەی کە پیاو پێی وایە گرنگن ــ ئەوان تەنیا بۆ خستنەوەی منداڵی شەرعین[٥٩]!.

بەم جۆرە دەبینین پیاوان لە ژیانی هاوسەرایەتی خۆیاندا هاوشانی عەقڵیی خۆیان نادۆزنەوە، چونکە نەخوێندەواری لەنێو ژناندا و جیاوازی گەورەی تەمەن لەنێوان ژن و مێردەکەدا و بەستنەوە و گیرپێدانی ژن لە ماڵەکەیدا و..هتد، وەك باسمان کرد، خەرەندێکی دروست کردووە لەنێوان هەردوو ڕەگەزەکەدا، ئیدی پیاوانیش ناچار بوون لە دەرەوەی ماڵدا بەدوای هۆکارەکانی چێژوەرگرتندا بگەڕێن کە ژنەکانیان لێی بێ

بەری کردبوو.ماڵ بۆ پیاوی هاونیشتمانی ئەسینایی پشت و پەنا و داڵدە نەبوو بەڵکو تەنیا شوێنی نووستنی بوو. زەینەفۆن دەڵێت: «ئەوەی ژن شەرەفدار ئەکات ئەوە نییە لە دەرەوەی ماڵەکەی بێت، هەروەها ئەوەی پیاو شەرەفمەند ئەکات ئەوەیە ئەوەندەی لە دەرەوە بەسەری دەبات لە ماڵەوە بە سەری نەبات»[٦٠]. پیاو لە زۆر باردا هەموو ڕۆژەکەی هەر لە ڕۆژهەڵاتنەوە تا ڕۆژئاوابوونی لە نێو شاردا بەسەر دەبرد، هەر ئەمەش بوو ماڵە ڕاستەقینەکەی؛ بەڵام ژن ماڵەکەی شورەی بووە و لەسەری بووە بە دڵسۆزی و ئەمەکدارییەوە تێیدا بمێنێتەوە.

ئەمە بە نیسبەت ئەرکەکانی ژن، بەڵام مافەکانی و بەتایبەتیش مافی سیاسی، هەرگیز بوونیان نەبووە، وەك گوتمان ژن لە بوارە سیاسییەکان و بوارەکانی ژیانی گشتیدا بچووکترین بەشداریی نەبووە و هیچ پەیوەندییەکیشی بە ئاداب و هونەر و کولتوورەوە نەبووە، هەروەها پێگە یاساییەکەیشی نزمتر بووە لە هی پیاو و بگرە هیچ شیاوێتییەکی یاساییشی نەبووە، نەیتوانیوە کار بەڕێوەبەرێت یان لەبەردەم دادوەراندا شاهیدی بدات، یاخود ببێتە یەکێك لە لایەنەکانی گرێبەستێکی یاسایی. ژن تا مردن هەر لەژێر ڕاسپاردە و سەرپەرشتیی باوکی و ئینجا مێردەکەیدا بووە، یان لەژێر سەرپەرشتیی نزیکترین خزمانی نێرینەیدا دەمایەوە.

باوك بۆی هەبوو لە حاڵەتی نەبوونی میراتگرێکی نێرینەدا وەسیەتی ماڵ و سامانی و کچەکەی بکات بۆ هەر پیاوێك کە خۆی ویستبای. پیاوەکەش دەبوو هاوسەرگیریی لەگەڵ کچەکەدا بکات تەنانەت ئەگەر پێویستی بە تەڵاقدانی ژنەکەی خۆیشی بکردایە! ئەگەر نا میراتەکەی لە دەستی خۆی دەردەکرد، خۆ ئەگەر باوك بمردایە و هیچ وەسیەتێکی جێ نەهێشتبا، ئەوا نزیکترین خزمانی بۆیان هەبوو داوای هاوسەرگیریی لە کچە میراتگرەکە بکەن ـــ خۆ ئەگەر کچەکە شوو کردوو بووایە ئەوا دەبوو ئەو مێردەی جێ بهێڵێت و شوو بە نزیکترین خزمی خۆی بکات[٦١].

دەبێت ئەم ڕەوشە خراپانەی ژنی ئەسیناییمان لە بەرچاو بێت، چونکە دەبینین کاتێك مولکایەتی سەرهەڵدەداتەوە جارێکی دیکەیش لای ئەفلاتون لە دیالۆگی

"یاساکان"ـدا دەردەکەونەوە. بەڵام دوای هەموو ئەوانە فەزیلەتی ژن ئەوەیە ناوی خۆی بپارێزێت و وەك پێرکلیسی گەورەترین سیاسەتمەداری ئەو سەردەمەی ئەسیناش لە وتارە جەنازەییەکەیدا دەیڵێت نەبێتە جێی مقۆمقۆی ئەم و ئەو وەك تەنانەت ئەگەر بە پیاهەڵدان و ستایش کردنیش بێت[٦٢]. ئەمە وێڕای ئەوەی خۆی عاشقێکی شەیدابوو و بەهۆی عەشیقەکەیەوە ژنەکەی خۆیی تەلاق دابوو!.

**٢- ژنی بیانی:**

لە چینی ژنی ئازادەوە ڕادەگوزەرێین بەرەو چینێکی تری ژنان ئەویش ژنانی بیانی[٦٣]. کەیسی بێگانە هیچ مافێکی ئەوتۆی نەبوو و جیاوك (إمتیازات)یشی لە هیچ شارێکی یۆنانیدا نەبوو، ئەو جیاوکانەیشی بە دەستی دەهێنان دەبوو هی خزمەتگوزاری بوونایە کە لە هاوەڵە ئازادەکانەوە دەهاتن. خۆ ئەگەر ئەمە بۆ پیاوی بیانی ڕاست بێت ئەوا بۆ ژنی بیانی ڕاستترە، ئەو وەتەنگەوەهاتووی پاراستنی شارەکە نەبوو، هیچ یاسایەکیشی لە بەرژەوەندی دانەدەنرا، بەڵکو دەبوو خۆی بە ڕێگای تایبەتی گرنگی بە بەرژەوەندییەکانی خۆی بدات یاخود "پیاوێکی ئازاد"ی دیبایەتەوە کە کارە فەرمییەکانی بۆ ئەنجام بدایە. پێداگری دەوڵەت لەسەر پرسی ژنە بیانییەکان بۆ ئەوەبوو کە شارەکە پیس نەکەن یان پاکێتی خوێنی هاونیشتمانی ئازاد پیس نەکەن بۆ ئەوەی ماف و جیاوك و موڵك وماڵەکان تەنیا بۆ ئەسینایییە خوێن پاکەکان بێت.. پیاوانی سیاسەتمەدار —بە لێهاتووترینیشیانەوە ـــ وای بۆدەچوون ئەگەر بێتوو ئەو بیانییانە بە داب و نەریتە بیانییەکەی خۆیان بەشداری لە کاروبارە سیاسییەکانی شاردا بکەن ئەوا مەترسیگەلێك پەیدا دەبن کە لەسەر شار دەبنە هەڕەشە و بگرە ئەمە خواوەندەکان تووڕە دەکات و هەست بە ڕسواکردن ئەکەن بۆیە تۆڵە ترسناکەکەیان زاڵ دەبێت.

لەبەرئەمە سپارتەییەکان ڕێیان بە بیانی نە دەدا، بە نێر و مێ-وە، لە شارەکەیاندا نیشتەجێ بن، ئەگەر بهاتایە چەند ڕۆژێك بۆ تەماشاکردنی

ئاهەنگەکانیش ئامادەبوونایە ئەوا دەبوو دواتر شارەکە جێ بهێڵن و ڕێیان نەدەدا تێکەڵ بە هاونیشتمانی بن.. بەڵام ئەسینا شارێکی بازرگانی بوو وێڕای ئەوەی پڕیشی بوو لە قۆڵبڕە بیانییەکان: کارە هونەرییەکان، نمایشکردنی دراما، ئاهەنگ و بۆنە ئایینییەکان، قوتابخانە فەلسەفییەکان، ژیانی سیاسی..هتد ــ ی تێدا بوو. ئەسینا نەیدەتوانی بیانی لەخۆی دوور بخاتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا دەبوو ئاگاداری خۆی بێت بۆ ئەوەی تێکەڵبوونیان بە هاونیشتمانیان نەبێتە مایەی گەندەبوونی خوێنی "پاك"ــی ئەسینایی. پاشانیش ئەسینا یاساگەلێکی دەرکرد کە هاوسەرگریی لەگەڵ ژنی بیانی و بە پێچەوانەیشەوە، قەدەغە کرد. خۆ ئەگەر ئەم "تاوانە گەورەیە" ڕووی دابا ئەوا مافی هەر هاونیشتمانییەك بوو لایەنی پەیوەندیداری لێ ئاگادار بکاتەوە، دەستبەجێ تۆتەمەتبارەکان دەگیران و موڵك وماڵیان دەستی بەسەردا دەگیرا و بیانییەکەش لە بازاڕی کۆیلەفرۆشاندا دەفرۆشرا. بەڵام هاونیشتمانیەکە قورسترین سزا دەکەوتە سەری.

پاشان ژنی بیانی نەیدەتوانی هاوسەرگیریی بکات، لە چاوی پیاوانی سیاسەتمەداری ئەسیناییەوە هاوسەرگیریی تاکە گوناهێك بوو کە ئەنجامی بدات، ئەمەی لێ دەرچێت ئیدی دەیتوانی هەرچییەکی ویستبای بیکردایە. چینی ژنە بیانییەکان نەدەکرا تا سەر بە پاکیزەییەکی تەواو بمێننەوە. عەقڵی گریکی لەخۆبایی بوو، بەم جۆرەش ژنە بیانیەکان چینێکی نوێیان پێك هێنا بۆ چێژپێدانی پیاوی ئەسینایی، پیاویش ئەوەی دۆزیەوە کە لە ماڵ لێی کەم بوو! ئەم چینە هەر لە گۆرانیبێژەکانەوە هەتا خانمی هۆڵە فیکرییەکانی دەگرتەوە، هۆگری و خۆشەویستی و چێژ و ڕۆشنبیریی و پێگەیشتنی عەقڵی ئا لێرەدا بوو..

بەم جۆرە ئەم چینە کەوتە پەیوەندی جۆر بەجۆرەوە لەگەڵ پیاوی ئەسیناییدا کە شەرمی دەکرد بە ڕاشکاوی هەست و سۆزەکانی بۆ خێزانەکەی دەر ببڕێت ــ کەچی جگە لە هاوسەرگیریی لێرەدا هەموو شتێك شیاو بوو، ئەوەیش بۆ وەلانانی کێشەی میرات، گریکیش لەمەدا هیچ کارێکی نەشیاوی نەدەبینییەوە، ژنەکان زیندانی و

پاکیزه و دڵسۆز بوون و ماڵیان هەڵدەسوڕاند و ڕێیان پێ نەدەدرا تێکەڵ بن، له کاتێکدا پیاوی ئەسینایی وای دەبینی "ژن" لەسەر سفرەی ئێواره و له ئاهەنگەکانی مەیخوارنەوەدا ڕەگەزێکی کەم و کورتە، له وەختی هەڵمەته سەربازییەکانیشدا ڕێیان نەدەدا ژنەکانیان لەگەڵدا بن، بەڵام هەمان ئەم کۆت و بەندانە لەسەر ژنە بیانییەکان دانەدەنران. پێویستییەك له ئارادا نەبوو بنەچەی بیانییەکان به پاکی بمێننەوه، ئەمە پرسێك بوو کە بەلای شارەوە و بەلای خواوەندەکانیشەوە بایەخێکی نەبوو.

بەم جۆره پیاوان دۆست و هاودەم و هاوڕێ ڕۆشنبیرەکانیان له ژنانی بیانی هەڵدەبژارد «ئەوانە تاکه چینی ژێر و ڕۆشنبیربوون لەنێو ژنانی ئەسینادا، هونەرییان دەخوێند، ڕێبازە فەلسەفییە نوێیەکانیان دەناسی. بایەخی هەمەجۆرییان به سیاسەت دەدا. ژنه ڕۆشنبیرانێکی لەم جۆره دەبووا له یۆناندا ببنه جێگەی نرخاندنێکی زیاتری پیاوان[٦٤]. بەڵکو به نزیکی هەر پیاوێکی گەوره، ژنه هاودەمێکی هەبووه که هاوسۆزیی کردووه و لەگەڵیدا بەشداری له تێڕامانە عەقڵییەکانیدا کردووه. سوکرات ئەگێڕێتەوه دیۆتیما Diotima[٦٥] یەکێك بووه لەوانەی هونەری خۆشەویستییان فێر کردووه، ئەویش ژنێك بوو له مانتینا Mantinea (خوان ٢٠١ حـ ــ ٢١٢ أ)، ئەو تاکه ژن نییە کە سوکرات لەبارەیەوە بۆمان دووابێت – ڕەنگە کەمێك وەستان لەسەر ئەم جۆره پەیوەندییانە لایەنی شاراوەی بۆچوونی فەیلەسوفەکانی ئەو سەردەمەمان لەبارەی ژنەوه بۆ دەربخات: سوکرات که ژنەکەی خۆیی له ماڵدا گیردابوو و ڕقی له عەقڵ و بیرکردنەوەی بوو، کەچی هەوڵی دەدا بۆ بینینی ژنه ڕۆشنبیرەکان و ڕێنماییکردنیان به ئاراستەیەکی دروستدا بۆ دروست کردنی پەیوەندی لەگەڵ پیاواندا.

"زەینەفۆن" دەگێڕێتەوه «کاتێك سوکرات گوێی لێبوو ژنێکی جوان له شاردا هەیە کە پێشوازی له هاوڕێیان دەکات و جوانی ئەم ژنەیش له سەرووی وەسفکردنەوەیە و بگره نیگارکێشەکان دەچن بۆ نیگارکردنی، به هاوڕێکانی گووت: "پێویستە بچین بۆ بینینی، چوون ناتوانین تەنیا به بیستنی ئەوەی خەڵکانی تر بۆمانی دەگێڕنەوه باش لێی تێبگەین". سوکرات چوو بۆ ماڵی "تیودۆتا

Theodota" و بینی نیگاری دەکێشرێت، بەجوانییە دلڕفێنەکەی سەرسام بوو و"هەستی بە سوپاس و پێزانین کرد چونکە بەهۆی پۆشینی نایابترین پۆشاکەوە جوانی خۆی بۆ دەرخستووین"..هتد.

فەیلەسوفی گەورەی ئەسینا لێی پرسی: پارەی خەرجیت لە کوێ بوو؟ ئایا ماڵ و سامانێکت هەیە، خانوویەکت هەیە خەرجیت دابین بکات یان کۆیلەگەلێك کە خەریکی کاری دەستی بن..؟ ئەویش وەڵامی دایەوە کە بۆ خەرجییەکانی پشت بە هاورێ دەست و دڵکراوەکانی دەبەستێت، دیسانیش فەیلەسوفەکە لێی پرسی بە چ ئامرازێك ئەو هاورێیانە ڕادەکێشێت، ئینجا ئامۆژگاریی تیۆدۆتای کرد بە چنینی تۆڕێك لە شێوەی تەونی جاڵجاڵۆکە.. "ڕاوکردنی پیاوان هونەرێکە پێویستە فێری ببیت.. ئایا ژمارەی ئەو هونەرانە نابینیت کە ڕاوچییەکان بەکاری دێنن بۆ ڕاوکردنی کەروێشکە وشکاوەکییەکان، کە ئاژەڵێکی کەم بەهاییشە؟ کاتێك بە شەوان کەروێشکەکان خواردن دەخۆن، ئەوان سەگەکان لەگەڵ خۆیان دەبەن بۆ ئەوەی بە شەو ڕاویان بکەن. کە بەرۆژیش کەروێشکەکان خۆیان دەشارنەوە، ئەوا ئەوانیش جۆرێکی تری سەگ بەکاردێنن کە بە ڕۆژ پشت بە هەستی بۆنکردن دەبەستێ. کاتێکیش دوژمنەکە خێرایە ئەوانیش سەگی ئێجگار زۆر خێرا بەکاردێنن، وێڕای ئەوەی تۆڕ لەسەرڕێی کەروێشکەکان دادەنێن بۆئەوەی تێیان بکەون..هتد. فەیلەسوفەکە باسوخواسەکە درێژە پێدەدات "لە بری سەگ دەتوانیت کەسێك هەڵبژێریت بتوانێت چاودێریی دەوڵەمەندەکان بکات کە حەزییان لە جوانییە ئینجا بیانخەنە نێو تۆڕەکەوە». پاشان جۆرەکانی تۆڕی بۆ وەسف دەکات: هەر لە بەکارهێنانی عەقڵەوە هەتا قسەی هەنگوینی و شیرین و هاوسۆزی و دڵناسکی و نیگای چاوەکان.. هەروەها ئاگاداری ئەکاتەوە لەوەی کاتێك هاورێیان "لە حاڵەتی تێریدان" خۆی نەخاتە بەردەستیان، بەڵکو پێویستە چاوەڕوان بێت تا ئەوان هەست بەوە دەکەن ئارەزوییان لێیەتی.. ئیدی لەم بابەتانەوە هەتا ئەم "ئامۆژگارییە بەرزانەی" کە فەیلەسوفەکە

پێشکەشی دەکات و بەشی یانزەی کتێبی سێیەمی یادەوەرییەکانی زەینەفۆن لەبارەی سوکراتەوە، پڕ دەکاتەوە[٦٦].

بگرە ئەفلاتون خۆی نموونەیەکی دیکەمان بۆ دەگێڕێتەوە کاتێك لە دیالۆگی مینکسینۆسدا لەبارەی سوکراتەوە بۆمان دەگێڕێتەوە: «مامۆستایەکی نایابم هەیە لە هونەری دەربڕیندا، زۆرێك لە وتاربێژە نایابەکانی فێر کردووە، لە سەرووی هەموویشییانەوە پێرکلیس-ی باشترین وتاربێژی یۆنان ــ لەم ڕۆژانەدا گوێم لێبووە کە وتارێکی جەنازەیی لەبارەی مردووەکانمانەوە ڕازاندۆتەوە-» مینکسینوسیش داوای چیرۆکێکی لێ ئەکا کە لەبارەی ئەوەوە بیستوویەتی و سوکراتیش لە زمانی "ئیسپازیا"وە —ئەویندارى پێرکلیس ــ وتارێکی نایابی بۆ دەگێڕێتەوە کە دیالۆگەکەی پێ تەواو دەبێت و لە شەش لاپەڕە پێکدێت (لە ٦٨٣ بۆ ٦٨٩ بەرگی — أ ــ لە وەرگێڕانەکەی جویتدا) و ژنە بیانییەکە تێیدا چاکە و مەردایەتی خەڵکی ئەسینا دەژمێرێت "کە تەنیا ئێمە ستایشی ناکەین، بەڵکو هەموو ڕەگەزی مرۆڤایەتی ستایشی دەکەن، بگرە لای خواوەندەکانیش خۆشەویستە و وەك دایکێکی بەسۆزە بۆ منداڵەکانی، چۆن ژن پاساوی دایکایەتی خۆی دەدات بەوەی کۆرپەکانی شیر بدات (نەك ژنێك کە ئەم سەرچاوەیەی نییە) هەر بەو جۆرەش وڵاتەکەمان پاساوی دایکایەتی خۆی دەداتەوە بەوەی گەنم و جۆ و هەرچییەکی تر کە مرۆڤ بۆ خواردن پێویستی پێیان بێت، بۆ نەوەکانی بەرهەم بهێنێت، ئەوەش نیشانەیە لەسەر دایکایەتیەکی ڕاستگۆیانەتر لە دایکایەتی ژن، چونکە ژن لە سکپڕی و منداڵبوونیدا لاسایی زەوی دەکاتەوە، نەك زەوی لاسایی ژن بکاتەوە»[٦٧].

ئیسپازیا Aspasia کە سوکرات ئاماژەی بۆ دەکات ژنێکی بیانی بووە، لە ناوچەی ماڵتەوە هاتووە و لە ئەسینادا ئۆقرەی گرتووە تا بۆتە ئەویندارى—پێرکلیس-ـی گەورەترین سیاسەتمەدار لە مێژووی ئەو شارەدا، ئیسپازیا دڵی داگیر کرد و ئەویش ئەگەر چی ژنیشی هەبوو کردییە هی خۆی، ئەمەش وای کرد لەگەڵ ژنەکەیدا ڕێك بکەوێت لەسەر جیابوونەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ "ئیسپازیا"دا تا ئەو کاتەی مردن

لە یەكیان جیا دەكاتەوە بیٚ ئەوەی بتوانن هاوسەرگیریی بكەن وەك ژن و مێرد بژین، چونكە یاسای ئەسینایی ئەم هاوسەرگیرییەی قەدەغە كردبوو[٦٨].

مێژوونووسەكانیش دەگێڕنەوە ماڵەكەی ئیسپازیا یانەیەك بووە بۆ كەسایەتییە گەورەكان لە ئەسینادا: «سوكرات بەردەوام لەویٚ بوو، هەروەها "فیدیاس" و "ئەنكساگۆراس"ـیش، ڕەنگە "سۆفۆكلیس" و "یۆربیدس"ـیش، لە هاوڕیٚ نزیكەكانی بووبن ـــ ڕاستییەكەی بە درێژایی مێژوو ژنێك نابینیتەوە كە "صالۆن"ـێكی ئەدەبی لەو ئاستە بەرزەدا هەبێت»[٦٩]. تەنانەت شاعیرەكانی كۆمیدیا ناویان نابوو "هیرا" یان خواژنی موڵكایەتی، ژنی گەورەخواوەند، وەك ئەوەی پێركلیسیش بە زیۆس حساب دەكرا.

لە هەموو ئەوانەوە دوو تێبینی سەرەكی پوختە دەكەین:

**تێبینیی یەكەم:**

كۆمەڵگەی ئەسینایی كۆمەڵگەیەكی باوكسالار بووە و تێیدا پیاو "سەروەر" و "خاوەن"ـی هەموو مافە مەدەنی و سیاسییەكان بووە و خاوەنی زەوی و خانووبەرە بووە. ئینجا خاوەنی خێزانیش بووە بە منداڵ و ژنەكەیشەوە. مافی خۆی بووە هەر منداڵێك لە منداڵەكانی لە سەروەختی لە دایكبوونیاندا ڕەت بكاتەوە. پیاو ئەو یاسایانەی داڕشتووە كە بە گونجاوی زانیوە بۆ پشت ئەستووركردنی ئەم مافانە، تەنانەت ئەگەر یاسادارشتنێكی سەیریش بووایە وەك ئەو یاسایەی ڕێی بە لەباربردنی منداڵ دەدا ئەگەر باوكەكە ئەم كارەی بویستایە، بەڵام ئەگەر ژن بە بڕیارێكی خۆی لەباری بەرێت ئەوا خۆی و هەركەسێكی تریش كە یارمەتی دابێت، تووشی سزا ئەكرد. ئەم جیاكردنەوەیە دەلالەتێكی زۆری هەیە، چونكە لەم حاڵەتەدا لەباربردن وەك كوشتنی بوونەوەرێكی زیندوو سەیری ناكرێت، بەڵكو پێشێل كردنی دەسەڵاتی باوكە یان تەعەداكردنە لە موڵكی خاوەنە شەرعییەكە![٧٠].

**تێبینی دووەم:**

پرسەکە پەیوەستە بە موڵکایەتی مادی و مەعنەوی و میراتەوە. ئەم موڵکایەتییەش کە باوك ویستوویەتی بۆ نەوەگەلێکی لە پشتی خۆی جێ بهێڵێت وای لێ کردووە وەك "بەشێك" لە ماڵ و سامانەکەی لە ژن بڕوانێت، هەمان ئەم گوزارشتە لای ئەفلاتونیش دەبینینەوە کاتێك باس لە "موڵکایەتی ژنان" یان "دەستکەوتنی هاوسەر" یان لایەنگیریی ژنی تایبەت..هتد دەکات، واتە هاوسەری تایبەت ئەرکییەتی منداڵ لە پشتی پیاوەکە بخاتەوە تا پیاوەکە بە دڵنیاییەوە ماڵ و سامانەکەی بۆیان بگوازێتەوە. بەڵام ژنی بیانی ئەویندار و دۆستی پیاو بووە و ئەرکیشیان چێژپێدانی بووە لە کاتە بەتاڵەکانیدا، بێ ئەوەی مافی هاوسەرگیریی و منداڵخستنەوەی هەبووبێت، بۆ ئەوەی "خوێنی بێگانە" دزە نەکاتە نێو کۆمەڵگەکەوە. بەم جۆرە ژن لە هەردوو بارەکەدا لە خزمەتی "سەروەر"دا بووە کە هەموو شتێکی هەیە، بەڵام ژن لەو "نزمتر"ە، چونکە لە خۆڵێکی جیاواز دروست بووە، وەك ئەوەی پێشتر هزیود لەبارەیەوە بۆمان دواوە و دواتریش ئەفلاتون پەسەندی کردووە!.

بەڵام ئایا سپارتە نموونەیەکی تری جیاوازمان پیشان نادات کە ژن دەکاتە خاوەنی پێگەیەکی بەرز، یان وەك دەڵێن خاوەنی مافگەلێکی یەکسان بە مافەکانی پیاو؟ ئایا وێنەی ژنی سپارتەیی کاریگەری لە زەینی زۆر لە فەیلەسوفان و پێش هەموویشیان ئەفلاتون نەکردووە؟ ئێستا ئەمە تاوتوێ دەکەین.

## دووەم: ژن لە سپارتەدا :

بە درێژایی سەردەمی کلاسیکی سپارتە بایەخێکی تایبەتی لای یۆنان، تەنانەت ئەسینایییەکانیش، هەبووە، هەر لە کۆتایی سەدەی حەوتەم هەتا سەدەی چوارەم (پێش زایین)، بە ئاوارتەکردنی چەند ماوەیەکی کەم، وەك بەهێزترین شاری یۆنانی لێی ڕوانراوە، بەتایبەتیش دوای دەستگرتن بەسەر هەرێمی میسینیا Messenia دا و

قەڵەمڕەویی بەسەر مەودایەکی بەرفراوانی زەویدا، بە بەراورد بە هەر شارێکی تر، بە کورتی یۆنانییەکان بۆ ماوەی سێ سەدە وا سەیری سپارتەیان دەکرد لە کاروباری جەنگدا شاری سەرمەشقە، لێرەوە ئاسایی بوو هەرکەسێکی سەرقاڵ بە سیاسەت بایەخێکی تایبەت بە سپارتە بدات، کە بە سەرکەوتووییە سەربازییەکەی تایبەتمەندی سیستەمەکەی خۆیی سەلماندبوو[٧١].

ئەفلاتون، لەبەر چەند هۆیەك، بایەخێکی ئاشکرای بە سپارتە و چینە ئەرستۆکراییەکەی دەدا، هەندێك لە هاوڕێ و خزمانی لە پایەبەرزانی ئەسینا لایەنگری سپارتەبوون و مەیلیان بۆی هەبوو و ڕەنگە هەڵوێستیشیان کاریگەری لە ئەفلاتونی گەنج کردبێت[٧٢]. پاشان دوای جەنگی پیلۆپۆنیز ساڵی ٤٠٤ پ. ز ئەفلاتون زیاتر بە سپارتە سەرسام بوو. ئەمەش لەو سیستەمە پەروەردەییەدا ڕوون و ئاشکرا دیارە کە ئەفلاتون لە دیالۆگی "کۆمار"دا دایڕشتووە و ئەم دیالۆگەشی ڕاستەوخۆ دوای بەزینی ئەسینا نووسیوە[٧٣].

وێڕای هەموو ئەوانەش کۆمەڵێك کارکردی دیکە هەبوون کاریگەرییان لەسەر ئەفلاتونی گەنج هەبوو، واپێدەچێ ئەو چەکی شۆڕەسوارانی بەکار هێنابێت، ئەو چەکەش —کاتێك کە دەوڵەت خەرجیی کەلوپەلی سوپاکەیی نەکردایە ــ تەنیا کوڕە دەوڵەمەندەکان کە نرخەکەییان لە تواناداا بوو لە مەیدانی جەنگدا بەکاریان دەهێنا[٧٤]. تەنیا ئەوان لە توانایاندا بوو ئامادەکارییەکانی سوارچاکان ئامادە بکەن، زۆر بەڵگەیش هەن لەبارەی ئەوەی کە ئەم چەکە زۆر لەژێر کاریگەری شێوازی ئەسینایییدا بووە[٧٥].

خۆ ئەگەر "گێڵن مۆرۆو" وای دەبینێ هەڵوێستی ئەفلاتون لەبارەی سپارتەوە تێکەڵەیەك بووە لە سەرسامی و ڕەخنە لێگرتن[٧٦]، ئەوا پێویستە سیستەمی سپارتە نیشان بدەین کە فەیلەسوفەکەمان پێی سەرسام بووە. پاشان ببینین ئەو ڕەخنانە چین کە ئاراستەی ئەم سیستەمەی کردووە. خۆ ئەگەر بمانەوێ وێنەیەکی ڕاستگۆیانەی

دەوڵەتی سپارتە بۆ خۆمان دروست بکەین ئەوا دەبێت دوو خاڵ بە زەینی خۆماندا بهێنین:

یەکەم: وەك پێشتریش باسمان کرد عەقڵی گریکی پێی وابووە شار گەورەترین ڕێکخستنی سیاسییە کە لەگەڵ وەزیفەی دەوڵەتدا تەبا بێت، لە لایەکی دیکەیشەوە بە تەواوی بە بیرۆکەی لەنێوچوونی تاك و بەردەوامی ڕەگەزی مرۆیی کاریگەر بووە، واتە بەردەوامی و مانەوەی شار لە ڕێگەی بەدوایەکداهاتنی نەوەکان. ئینجا ئەو بیرۆکە سەرەکییەی کە لای ئەوان هەموو یاساکانی ئاراستە دەکرد بریتی بوو لە درێژەکێشانی شار و بەردەوامیی پەرستنی خوداکان بێ ئاوڕدانەوە لە ویستەکانی تاك و هەر لە بنەڕتیشەوە بوونی تاك لەپێناو دەوڵەتدا بووە نەك بە پێچەوانەوە، بۆیە پێویستە قوربانی بە هەموو بەها کەسییەکان بدرێت تا ئەم دەوڵەتە دابمەزرێت و بەردەوام بێت، ئەم بیرۆکەیە لە سپارتەدا بایەخێکی تایبەتی هەبووە.

دووەم: بوونی هەلومەرجی تایبەت بە سپارتەییەکان خۆیان. دەوڵەت بەرفراوان بوو و مەودایەکی بەرفراوانی زەویی داگیر کرد. ژمارەیەکی زۆری کۆیلە کەوتە دەستیان کە دەبوو لەدەستی خۆیاندا بیانهێڵنەوە بۆ ئەوەی پێویستییە سەرەکییەکانی هاونیشتمانیان دابین بکەن. بگرە سپارتەییەکان جەنگی وایان بەرپاکردووە کە بۆتە مایەی بەکۆیلەبوونی تەواوی گەلەکە ﴿گەلە شەڕ لەگەڵدا کراوەکە﴾ و کۆیلایەتی بەسەر میللەتەکەدا سەپاندووە وەك ئەوە لەگەڵ دانیشتوانی "هیلۆس Helos"ـدا کردییان کە گەلێکی تەواو —ژمارەیەك شەش هێندی سپارتەییەکان دەبوو ـــ بە ناوی "هیلتوتین" بوونە کۆیلە و ئەم وشەیەش هاومانای کۆیلەیە. بۆیە دەبوو سپارتەییەکان —وەك ئەرستۆ دەڵێت ـــ هەمیشە لە بەهرەی ئامادەباشیدا بن چونکە هیلوتییەکان دوژمنیان بوون و لە دەوریان خۆیان بۆ نابوونەوە[٧٧].

وێڕای ئەو گرێبەستانەی لە وەختی خۆ بەدەستەوەدانیاندا وەك کۆیلە لەگەڵیان دەیانبەستن کەچی زۆرجار مامەڵەی سپارتەییەکان لەگەڵ ئەم جۆرە کۆیلەیەدا دڵڕەقانە بووە! ـــ دڵڕەقییان گەیشتە ڕادەیەك کە لەلایەك جاروبار پشتیان دەبەست بە

لەنێوبردنی بەشێکیان بۆ مەشقپێکردنی گەنجی سپارتەیی لەسەر جەنگ، لە لایەکی دیکەیشەوە بۆ ئەوەی ژمارەیان زۆر نەبێت و مەترسی دروست بکەن بۆ سەر دەوڵەت. ئەوان ڕێیان بە گەنجەکان دابوو هێرش بکەنە سەر کێڵگەکان —کۆیلەکان وەرزێرییان دەکرد ــ و هەر کەسێکیان بۆ ڕێك بکەوێت بیکوژن. ئەمەش شرۆڤەی ئەوەمان بۆ دەکات کە دەبێت سپارتە بەردەوام لە دۆخی ئامادەباشیدا بووبێت تا هەم لە ناوەوە و هەم لە دەرەوە ڕووبەڕووی دوژمنەکانی ببێتەوە. لەبەرئەمە دەوڵەت لە سەربازگەیەکی گەورەی دەکرد کە هەمیشە ئامادەی جەنگبووە و هەموو سیستەمی پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی ملکەچی پێویستییەکانی جەنگ کردبوو. "لیکۆرگۆس"ــی گەورە یاسادانەریان کە لە پەرستگای دێلفییەوە فەرمانی پێدەگەیشت و دەیکردنە بنچینەی یاساکانی، دەڵێت پاراستنی دەوڵەت بە دروستکردنی دیوارە بەرزەکان لە دەوری نابێت، بەڵکو بە ئامادەکردنی دیوارێکە لە پیاوانی توند و تۆڵ. ئەفلاتون پێی وابووە یاساکانی سپارتە کە لیکۆرگۆس دایڕشتوون سروش بوون و لە ئەپۆلۆوە بۆی هاتوون (یاساکان ٦٣٥ ــ ٦٩٦أ).. ئەم یاسایانەش بۆ ماوەی چوار سەدە بێ دەستکاری مانەوە، ئەم درێژەکێشان و بەردەوام بوونە لای فەیلەسوفەکەمان و هاوچەرخە پارێزکارەکانی لەخۆیدا جێگەی سەرسوڕمان و نرخاندنە.

لێرەوە سپارتە بایەخیان بە ژن دا، ئەرکی یەکەمی دەوڵەت هێشتنەوەی ئەو ژمارە زۆر و زەوەندی کۆیلە، و پاراستنی بەردەوامی موڵکایەتییان دژی داگیرکەران بوو، ئەمەش سەرناگرێت تەنیا بە ئامادەکردنی سەربازانێکی ئازا و سوارچاکانێکی دلێر نەبێت.

کاتێکیش ژن کەرەستەی سەرەکی بەرهەمهێنانی ئەم سەربازە ئازا و نەبەزانە بوو، دەبوو گرنگی پێ بدرێت و بایەخ بە بوارەکەی بدرێت، بەڵام ڕاستییەکەی ئەم بایەخدانە نزیك بوو لە بایەخدانی شوان بە جوانەگاکانی با بڵێین بۆ ئەوەی گوێرەکەکانیان باشتر بن. ئەمە نە هەقبەشی (إنصاف)ــیە و نە یەکسانییە و نە

بەرزکردنەوەی پێگەکەیەتی و بگرە پێدانی سادەترین مافی وەك مافی هەڵبژاردنی هاوسەر نییە، بەڵکو هەموو مەبەستی سپارتەییەکان ئەوەبوو کە پیاوانێکی توند و دلێریان دەویست. ئینجا دەبوو دایکانیش لەم ئاستەی جوامێرییدا بن، دەوڵەتیش کەسایەتی ژنێکی خۆڕاگر و بوێر و زبری دەویست ـــ دەبوو دایك هەموو ئەم سیفەتانەی هەبێت بۆئەوەی بۆ نەوەکانیی بیانگوازێتەوە. ئەوان جەستەیەکیان پیرۆز دەکرد کە بەهێز و ماسولکە پتەو و دوور لە نەخۆشی بێت، نەك لەبەر جوانییەکەی یان ڕێکی بالاّ، بەڵکو لەبەر توانای بەرگەگرتن و ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنان لە جەنگدا، ئینجا دەبوو ژن ئاوەها بووایە، بەم جۆرە ژنی پیاوانە پەیدابوو کە بە سیفەتی پیاوانەوە خۆی ڕادەوەشاند و بە تەواوی خاڵی بوو لە ناسکی مێیینەنە یان هەست و سۆزی ژنانە، ئەم وێنەی ژنیش لە دیالۆگی کۆماری ئەفلاتوندا دەبینینەوە.

گومانی تیا نییە هۆکارێکی سەرەکیی سەرسامیی ئەفلاتون بە سپارتە سیستەمە پەروەردەکەی بوو، تەنانەت بیرکردنەوەی ئەو لە سەرەتادا بە ئاراستەی ئەم تایبەتمەندییە سەرەکییەی ژیانی سپارتەدا بوو[٧٨]. "لیکۆرگۆس" سیستەمێکی ئامادەکردنی جەنگاوەرانی دانا کە لە زۆر لایەنەوە لە نەریتی جەنگاوەرانی خێڵە سەرەتاییەکان دەچوو، ئەفلاتون و ئەرستۆش پێیان وایە دەستووری سپارتە ئەدگارە سەرەکییەکانی لە کریتەوە وەرگرتووە. بەڵام وا پێدەچێت لێکچوونی نێوان سپارتە و کریت بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەردووکیان لە یەك بنچینەی سەرەتایین[٧٩].

پەروەردە ئیشی سەرەکی دەوڵەت بوو. ئەم بایەخدانە، لە سەردەمی ئەفلاتوندا، بەلای زۆرێك لە شارە یۆنانییەکانی ترەوە نامۆ بوو، کە تەنیا باوك بەرپرسیار بوو لە پەروەردەکردنی منداڵەکانی[٨٠].

بەڵام لە سپارتە هەر کە منداڵەکە لە دایك دەبوو یەکسەر پیشانی لیژنەیەکی چاودێر دەدرا، خۆ ئەگەر لاوازییەکی تێدا بەدی بکرایە، یان کەم و کوڕییەکی تێدا ببینرایە، فەرمان دەدرا لە لوتکەی شاخێکەوە فڕێ بدرێتە خوارەوە بۆ ئەوەی بمرێت! بەڵام ئەگەر ساغ و سەلیم بووایە دەبرایەوە ماڵێ تا هەشت ساڵی یەکەمی تەمەنی

لەویٚ تێپەڕێنێت و ئینجا دەوڵەت ئەرکی پەروەردەکردنی دەگرتە ئەستۆ و دەیبردە نێو "مێگەل"ـەوە –ئەمە ناوە حەرفییەکەیەتی[٨١] ــ لەژێر سەرپەرشتیاری ڕاهێنەرێکدا، مەبەست لەم مەشق و ڕاهێنانەیش مەشقپێکردنی ئەم لاوانەش، وەك ئەوەی لای ئەسینایییەکان باو بوو، وەرگرتنی لەشرێکی و بەهرەی جولەکان نەبووە بەڵکو جوامێریی و پتەوی و توانای شەڕکردن بووە، تەنانەت گەورەکان لەنێو لاوەکاندا، بە تاك و کۆ، کێشمەکێش و هەرایان دەنایەوە بۆ ئەوەی لە شەڕدا بە گژی یەکدا بچن، تا لەسەر شەڕکردن ڕابێن و هێزیان زیاتر بێت، ئەو لاوەیشی کە نیشانەی ترسی تێدا دەربکەوتایە بە توندی سزا دەدرا.

لە سێزدەهەمین ساڵیدا لاوەکە دەنێردرایە کۆمەڵێك "مێگەل"ـی ترەوە و مەشقی جەستەیی و عەسکەری پێدەکرا، ئەمانە جەستەیان ڕووت بوو و لەسەریان بوو بە بێدەنگی بەرگەری ئازار و ناڕەحەتی بگرن و لە ژیانێکی کولەمەرگیدا بژین، ئەوانە بە کۆمەڵ لەسەر گەلای خورما یان لقی داران دەنووستن کە خۆیان بێ بەکارهێنانی چەقۆ لێیان دەکردەوە. بە درێژایی ساڵیش یەك بەرگیان دەپۆشی. بە هاوین و زستانیش لە هەوای کراوەدا دەنوستن و تەنیا خواردنێکی هاکەزاییان دەخوارد و ڕێی خۆ شتنیان پێ نەدەدرا، چونکە جەستەی ئەکردە جەستەیەکی فشۆڵ و شێدار، خۆ ئەگەر کەسێك ویستبای ئەوا دەبوو لە ڕوباری "یوروتس EUROTAS" خۆی بشتایە کە لە وەرزی زستاندا زۆر سارد بوو.

لە تەمەنی بیست ساڵدا دەچوونە ڕیزی هێزی گشتیی چەکدارەوە تا تەمەنی سی ساڵی کە ئیدی ڕێی هاوسەرگیریی و چوونەنێو کۆمەڵەی گشتییان پێ دەدرا و دەبوونە خاوەنی هەموو مافێکی مەدەنی[٨٢]، بەڵام بە درێژایی دە ساڵ لەگەڵ هاوڕێکانیدا "ئەندامانی تاقمەکە" دەژیا، لەم ماوەیەیشدا نە ژنەکەی دەبینی و نە بۆی هەبوو سەردانی بکات مەگەر لە کاتی شەودا و خۆی بدزیبایەتەوە و بە دزییەوە سەردانی بکردایە، هەروەها ئەرکیی ماڵەوەیشی لەسەر نەبوو. یان وردتر بڵێین خێزانێکی ڕاستەقینە لە ئارادا نەبوو. بەڕاستی ئەوە سەیر بوو لە میانەی ئەو مەشقە زۆرانەوە

که هەر لە ساڵانی زووەوە دەستی پێ دەکرد، هیچ بایەخدانێك بە خوێندن و نووسین و تەنانەت میوزیکیشی تیا نەبوو، تەنێ ئەو گۆرانی و مارشانە نەبێت کە بەشان و باهوی ڕابردوودا هەڵیان دەدا و خەڵکیان دەخستە سەر کەڵکەڵەی شەڕکردن، ئەمە لەو خاڵانەیە کە ئەفلاتون وەك لەکەی سیستەمەکەی سپارتە لێی ڕوانیوە، "لیکۆرگۆس" بڕوای وابووە دەبێت منداڵان لەڕێگەی بیستن و ئەزبەرکردنەوە فێری یاسا و ڕێساکان بن، نەك لەڕێی نووسین و خوێندنەوەوە. هەروەها بۆ قەرەبووکردنەوەی ژەمە بێ ئەرزشەکانی وەك دزینی کۆگا گشتییەکان، ڕێ بە زۆر شێوازی سەرەتایی سزادان دەدرا وەك لێدانی جەلد لە هەرکەسێك کە لە وەختی تاوانەکەدا بگیرایە، نەك لەبەرئەوەی دزی کردووە، بەڵکو لەبەرئەوەی دەستەکەی کەوتۆتە ڕوو و شکستی هێناوە. لەمەشەوە وەك باسمان کرد، ڕێیان پێدەدرا بە کوشتنی "هیلۆتییەکان". جاری واش هەبوو لە دەشتێکی کاکی بەکاکیدا جێیان دەهێشتن و دەبوو یان بۆ ماوەیەك خۆیان بژێین، یاخود لە برسا بمرن.

هەر "لیکۆرگۆس" بوو سیستەمی خواردنی سەر سفرەی هاوبەشی دانا، ئەمەش بەجۆرێك کە پیاوان خواردنیان لە کۆمەڵەیەکی بچووکی پازدە کەسیدا دەخوارد، دەبوو هەر بەشدارێکیش بەشێکی دیاری ئارد و شەراب و نان و هەنجیر بدات بە کۆگای گشتی. هەروەها بە دراویش بەشداری بکات بۆ ئامادەکردنی ئەو خواردەمەنییانەی کە ئامانج لێیان «ڕێ بە هیچ کەسێك نەدرێت بە تەنیا لە تاریکیدا خۆی قەڵەو بکات وەك ئەوەی گەمژە نەوسنەکان دەیکەن». تەنانەت پادشاکانیش خۆیان پەیوەست بوون بەو ڕێسایەوە، ئەگیس شا AGIS «کاتێك بە سەرکەوتوویی لە شەڕێکی دژ بە ئەسینایییەکان گەڕایەوە نەیتوانی ڕەزامەندی بەدەست بهێنێت بۆ خواردنی نانی شێوان لە ماڵەکەی خۆیدا و لەگەڵ ژنەکەیدا، هەر هاونیشتمانییەکیش لە بەشداریی و پشکدان دوا بکەوتایە یاخود ملی بۆ نەدایە ئەوا ڕەگەزنامەی لێ وەردەگیرایەوە و مافی دەفەوتا، سفرە هاوبەشەکانیش تەنیا هی

پیاوان بوو بە بێ ژنان، ئەوەش خاڵێکی ترە کە ئەفلاتون وەك لەکەی ئەو سیستەمە لێی ڕوانیوە».

وێڕای ئەمانە کچان لە ماڵدا دەمانەوە بەڵام ملکەچ دەبوون بۆ چاودێریی و سەرپەرشتیی دەوڵەت. هەر کچێك بۆ ئەوەی بونیادەکەی بەهێز ببێت و جەستەیەکی تەندروستی هەبێت و منداڵی تەندروست بخاتەوە بۆی هەبوو بەشداری لە یارییە قورسەکاندا بکات، وەك یاریی ڕاکێشان و زۆرانبازیی و هەڵدانی پانکەلە (قرص) و تیرهاوێژیی «هەوەرها دەبوو کچ لە کاروانی ئاهەنگە گشتییەکاندا، یان لە کاتی سەمادا، بە ڕووت و قووتی و بە بەرچاوی گەنجانەوە بڕواتە ڕێوە بۆ ئەوەی ئەمە ببێتە هاندەری بایەخدان بە جەستەی، چوون کەشفبوونی نەنگی لە جەستەیدا وای لێ دەکرد چارەسەری ئەم نەنگییانە بکات، بە بۆچوونی ئەوانیش ڕووتیی کچ بە هیچ جۆرێك مایەی شەرم نەبوو، بە داخەوە ئەمە لای ئەفلاتونیش وایە، ئەگەرچی خەسڵەتێکی سەرەکی کۆمەڵگەی سەرەتایی نیمچە ئاژەڵیی بووە»[٨٣].

هەروەها لە کاتی سەمایشدا بە سرود و پیاهەڵدان کچان ستایش دەکران کە ڕێزلێنان بوو لەو کچە بەجەرگانەی دەچوونە نێو شەڕ و کێشمەکێشمەوە و گاڵتەش بەو ترسنۆکانە دەکران کە لە مەیدانی جەنگ هەڵدەهاتن. هەندێك مێژوونوس دەگێڕنەوە کچان لە پێشبڕکێ و کێبەکێکاندا لەگەڵ کوڕانی گەنجدا بەشدارییان کردووە. ڕێگاش بە کچی نەخۆش نەدەدرا هاوسەرگیریی بکات چونکە پێویست بوو بنەچەکە بە تەندروستییەکی تەواوەوە بمێنێتەوە و دەبوو کچە نەخۆشەکەیش خۆی لە هاوسەرگیریی بەدوور بگرێت[٨٤]. دەوڵەت ئاگادارییەکی گشتی بۆ پیاوان و ژنان لە وەختی هاوسەرگیریدا دەردەکرد بۆ ڕەچاوکردنی باری تەندروستی ئەو کەسەی کە دەکرایە هاودەم، بە جۆرێك کە ڕێ نەدەدرا هیچ لاوازی و نەخۆشییەك لە هاوسەرگیریدا هەبێت، لەبەر ئەمەبوو کە فەرمانی پێ بژاردن بە پارە بەسەر شا ئەرخیداموس ARCHIDAMUS دا سەپێنرا چونکە هاوسەرگیریی لەگەڵ ژنێکی کورتە بنەی بێ جورمدا کردبوو[٨٥].

تەمەنی هاوسەرگیریی وەك دەوڵەت دیاریکردبوو بۆ پیاوان سی ساڵ بوو و بۆ ژنانیش بیست ساڵ (ئەوەش نزیکە لە تەمەنی هاوسەرگیریی لە ئەسینادا) بەڵام قەیرەیی و ڕەبەنی لە سپارتەدا تاوانێك بوو کە کەسەکەی لە مافی هەڵبژاردن و تەماشاکردنی ئەو کاروانە گشتییانەی کچان و کوڕانی ڕووت تێیدا سەمایان دەکرد پێ بێ بەش دەکرا، ئەو کەسەیشی بە ئەنقەست مکوڕبووایە لەسەر هاوسەرگیریی نەکردن ئەوا هەر وەختێك بووایە ژنان پەلاماریان دەدا و بە توندترین شێوە ئازایاریان ئەدا.

ڕاستییەکەی هاوسەرگیریی لە سپارتەدا زۆرێك لە خەسڵەتەکانی هاوسەرگیریی کۆمەڵگەی سەرەتایی هەڵگرتبوو، دایك و باوکان هاوسەرگیرییەکەیان ڕێکدەخست، خۆ ئەگەر ڕێ بکەوتنایە ئەوا ئەبووا زاوا بووك "هەڵگرێت/ ڕەدووی بخات" یان بە زۆری زۆردارەکی لە ماڵی باوکی بسێنێت، چاوەڕوانیش دەکرا لەم لێ سەندنەدا ڕووبەڕووی بەرتەك ببێتەوە، ئەمەش مانای وایە دەربڕینی شیاو کە گوزارشت بێت لەم هاوسەرگیرییە وشەی "دەستدرێژی"ـیە[٨٦]، خۆ ئەگەر ژمارەیەکی زۆر لە گەورەکان بێ هاوسەرگیریی بە جێ هێڵدرابان، ئەوا ئەشیا ژمارەیەك پیاو هەمان ژمارە کچیش لە کونجێکی تاریکدا کۆ بکرانایەتەوە پاشان ئەمانە سەرپشك دەکران کە هەر پیاوێك هاوبەشی ژیانی خۆی لە تاریکیدا هەڵبژێرێت[٨٧]. ئەو سیستەمەیش سیستەمی هەڵبژاردنی هاوسەر لەنێوان پاسەوانەکانی ئەفلاتونمان بیر دەخاتەوە. ئیدی لە هەموو بارودۆخێکدا کچ بۆ هەڵبژاردنی هاوسەری دواڕۆژی خۆی ڕای تایبەت بەخۆی نەبووە.

ڕاستییەکەی هەلومەرجی ژن لە سپارتە باشتر لە شارەکانی تری یۆنان نەبوو، بە پێچەوانەی بۆچوونی هەندێك توێژەرەوە کە چەند مەشقێکی جەستەیی کچان و دەرچوونیان بە ڕووت و قووتی بە بەردەم گەنجاندا بە شەوارەی خستوون، وەك ئەوەی کۆمەڵگە سەرەتاییەکان ئەمەیان نەکردبێت، هەروەها هەندێك بیرمەندیش بە تەواوی هەڵوەشانەوەی خێزان و ئازادبوونی ژنانیان پێکەوە بەستەوە، بۆیە لە کاتێکدا خێزان

بە واتایەکی ورد و ڕاستەقینە لە سپارتەدا نەبوو، ئەوا هەندێك پێیان وایە ئەمە واتە پێگەبەرزیی ژنان، ئەوەش خاڵێکی گرنگە و پێویستە هەڵوێستەیەکی کورتی لەسەر بکەین چونکە هۆکاری تێکەڵ و لێتێکچوونێکی زۆر بووە لای شرۆڤەکارانی کۆماری ئەفلاتون ــ بەداخەوە سیمۆنە دی بوڤوار یەکێکە لەوانە، ئەو دەڵێت:

«لەبەرئەوەی چەوساندنەوەی ژنان دەگەڕێتەوە بۆ ئارەزووی نەمریی خێزان، پاراستنی موڵکایەتی تایبەت، ئەوا بە هەمان ئەو ئەندازەیەی ژن لە خێزان ڕزگاری ئەبێت لە پاشکۆیەتیش ڕزگار ئەبێت. خۆ ئەگەر کۆمەڵگەیەك موڵکایەتی تایبەتی قەدەغەکرد و ئینجا خێزانیشی ڕەت کردەوە ئەوا بەختی ژن بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو ڕوو لەباشی دەکات، لەبەرئەوە دەبینین شاری سپارتە کە (لە خاوەندارێتی زەویدا) ملکەچی سیستەمی کۆمۆنەیی "المشايعه" بووە، تاکە شاری یۆنان بووە کە بە یەکسانی و هاوشانی پیاو مامەڵەی لەگەڵ ژندا کردووە، کچەکان وەك کوڕان جلیان دەپۆشی و ئیشی ژن لە کاری ناو ماڵی مێردەکەیدا قەتیس نەکرابوو، مەگەر بە دزییەوە و لە وەختی شەودا ئەگینا ڕێ بە پیاوەکە نەدەدرا و بۆی نەبوو سەردانی ژنەکەی بکات، ژنەکەی موڵکی تایبەتی ئەو نەبوو، ڕێ دەدرا پیاوی تریش لەگەڵیدا بخەوێ لەبەر هۆکارگەلێك کە پەیوەست بوو بە باشترکردنی بنەچەکە. پاشانیش کە بیرۆکەی میرات نەما بیرۆکەی زیناش لەنێو چوو، سەرجەم منداڵەکانیش هی دەوڵەت بوون، ئیدی ژنیش تاکە پیاوێك بە هۆی ئیرەییەوە نەیدەکرد بە کۆیلە، یان تۆ بڵێ لەبەرئەوەی پیاوی هاونیشتمانی خاوەن موڵکێکی تایبەت و نەوەیەکی دیاریکراوی نەبوو، ئەوا ئیدی خاوەنی ژنیش نەبوو، پاشانیش دەبوو ژن بە تەواوی خۆی بۆ دایکایەتی تەرخان بکات وەك ئەوەی پیاو خۆی بۆ شەڕ تەرخان دەکرد»[٨٨].

ئەم دەقە سەیر و سەمەرەیە خانمە نووسەرێك نووسیویەتی کە ڕەنگە بە قووڵییە زۆرەکەی لەو نووسینانەی تر بە نرختر بێت کە لەبارەی ژنەوە نووسراون، دەڵێم سەیر و سەمەرە چونکە بوڤوار خۆیشی پێشتر لە هەمان کتێبدا دەرکی بەوە کردووە کە «ڕزگاربوون لە خێزان و هەڵوەشاندنەوەی بە ناچاری مانای ئازادبوونی ژن نییە.

نموونەگەلێکی وەك سپارتە و ڕژێمە نازیی هەن بەڵگەی ئەوە دەدەن بە دەستەوە ژنان بەهۆی شوێنکەوتەیی تەواویان بۆ دەوڵەت لە پیاوان کەمتر نەچەوسێنراونەتەوە»[٨٩].

ئەوەی سەیرە ئەو خانمە نووسەرە بەڵگەی یەکسانی بەوە دەهێنێتەوە کە «کچانیش وەك کوڕان جلیان پۆشیوە». وەك ئەوەی یەکسانی واتای ئەوە بێت ژن بخرێتە سەر چەرپای (پرۆکرست) و ئەو زیادە و جیاوازییانەی لێ ببڕدرێتەوە کە دەیکەنە ژن و لە پیاوی جیا دەکەنەوە. ڕاستییەکەی هەر ئەمە بوو لە سپارتەدا ڕوویدا، لەوێ وەك ئەرستۆ و ئەوانی تریش دەڵێن جگە لە ژنێکی "بە پیاو بوو" ، هیچی تر لە گۆڕێدا نەبوو[٩٠]. چونکە ژن لە سپارتەدا ناسکی و مێینەیی لێ دەکرایەوە و شەقڵی پیاو بە سەریدا زاڵ دەبوو، کاتێکیش مێردەکەی یان منداڵەکەی لە جەنگدا لە دەست بدایە ڕێی پێ نەدەدرا هیچ هەستێك دەببڕێت و گوزارشت لە هەست و سۆز و لاوازی و ترس بکات»[٩١]. وەك پلورتارك دەڵێ «ژنانی سپارتە بە بوێریی و پیاوەتی و زاڵبوونیان بەسەر پیاوەکانیان جیا دەکرێنەوە و بە ڕاشکاویش لەبارەی هەموو شتێکەوە قسەیان کردووە»[٩٢]. من پێم وا نییە ژنی سپارتەیی وەك ئەوەی سیمۆن دی بوڤوار دەڵێت ئەرکی دایکیایەتی جێ بەجێ کردبێت ــ خۆ ئەگەر یاسای سپارتی لەسێدارەدان و لەنێو بردنی کۆرپەی لاوازی سەپاندبێت، ئەوا دایك خۆی بۆ وەدیهێنانی ئەم ئامانجە پەنای بردۆتە بەر ڕێگای تر، بێ ئەوەی لەبەرامبەر کۆرپەکەی هیچ هەست بە سۆز و هەستی دایك کردبێت «کۆرپە لە کاتی لەدایکبوونیدا لە دەفرێکی شەرابدا نوقم دەکرا و هەر بەو جۆرەش بۆ چەند ساتێك لێی دەگەڕان، خۆ ئەگەر ژیابا ئەوە بەڵگەبوو لەسەر هێزی جورم و جەستەی و شیاوی پەروەردە بوو، ئەگەریش مردبا ئەوا دایك ئەرکەکەی خۆی بەرامبەر کۆمەڵگە بەجێ دەگەیاند، ئەویش کۆمەڵگەی لە بوونەوەرێکی لاواز و ڕیوەڵە ڕزگار دەکرد کە شایەنی ژیان نەبووە»..[٩٣]. ئینجا وەك باسمان کرد منداڵە ساواکە پیشانی لیژنەیەکی چاودێران دەدرا، ئەگەر بە ساغی بیاندیبا دەیان گێڕایەوە بۆ دایکی بۆئەوەی شیری

پێ بدات و هەتا هەشت ساڵی پەروەردەی بکات، بەڵام دایك لە کاتی پەروەردەکردنی منداڵەکەدا چی دەکرد؟

«دەبوو بەپێی سیستەمێك بڕوات کە دەوڵەت وەك ڕێنمایی بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکە پێیدا بوو، دەبوو بواری گەشە و جوڵەی بۆ بهێڵێتەوە و لە پەڕۆ و پاتاڵ و قوماتەی زۆرەوە نەیپێچێت، هەروەها دەبوو دلڕەقانە مامەڵەی لەگەڵ بکات، نەهێڵێت بگری، وەڵامی داواکانیشی نەداتەوە. هەروەها لە تاریکیدا بەجێی بهێڵێت بۆ ئەوەی لەسەر نەبەردی و ئارامگرتن و توانای بەرگەگرتن ڕا بێت»..[٩٤].

لە هەموو حاڵەتەکاندا ئێمە هەست ناکەین لەبەردەم "دایك" داین بە واتای وردی وشەکە. لەو چیرۆکانەدا کە "بەجەرگی دایك"ـێکمان بۆ دەگێڕێتەوە کە کوڕەکەی خۆی سەربڕیوە لەبەرئەوەی کوڕەکەی لە جەنگ هەڵهاتووە ــ هیچ توانایەکی دایکایەتی نابینمەوە تەنانەت ئەگەر هەڵهاتن لە ترساندا شایەنی سزای دەوڵەتیش بێت. ئەوە دایکێکی دڕندەیە کە پەنا بۆ سەربڕینی کوڕەکەی دەبات تەنانەت ئەگەر هۆکارەکە نیشتمانپەروەرانەیش بێت، چونکە دەبێت هەست و سۆزی بەرامبەر منداڵەکەی هەزاران جار بیخاتە گومان و دوو دڵییەوە..

ڕۆسۆ دەڵێت «هاونیشتمانی سپارتەیی بە تەواوی شوناسی خۆی لەدەست دابوو تا ئەوەی بە دەست هیچ ململانێیەکی ناوخۆییەوە گیری نەدەخوارد، فەزیلەتی نیشتمانپەرەوەرییش لای بووبووە شێوەیەکی سروشتی»[٩٥]. ئەو دایکە سپارتەییەی کە پێنج کوڕی لە سوپادا هەبوو، لە ماڵ دەچووە دەرەوە بۆ سۆراغ و هەواڵی جەنگ و هەرکات کۆیلەیەکی ببینیایە —بەدەم گیان لەرزینەوە ــ هەواڵی لێ دەپرسی ئەویش وەڵامی دەدایەوە «هەر پێنج کوڕەکەت کوژراون».. بەڵام ئەویش بە لوتبەرزییەوە وەڵامی دەدایەوە «ئەی کۆیلەی ڕسوا جا کەی من ئەوەم لێ پرسیویت؟». ئەویش دیسان دەیگووت «دە ئەگەر هەواڵی جەنگم لێ دەپرسیت دەڵێم سەرکەوتووین». ئەوکاتە دایکەکە بە پەلە خۆی دەگەیاندە پەرستگەکە بۆ ئەوەی سوپاسی خوداکان

بکات..[96]. کاتێکیش دایکەکە منداڵەکەی دەناشت دەیگوت «بە ڕاستی ئەوە چارەنووسێکی گەورەیە.. ئایا لەبەرئەوە نایبینێژم کە لەپێناو سپارتەدا مردووە؟»[97].

ئایا ئەمە دایکایەتی ڕاستەقینەیە؟ ڕاستییەکەی لێرەدا هیچ نابینین جگە لە دڵڕەقییەکی سەرەتایی کە تەنیا دڵڕەقی و دڕەندەیی پیاوی سپارتی هاوقەدیەتی.

دەرهەق بە هاوسەرگیریش ئێمە لەبارەی ئەوە نازانین کە ئەم هاوسەرگیرییە تاکەکەسی بووە یان بە کۆمەڵ، "ئەنگلز" هەوڵیداوە شرۆڤەی ئەمە بکات بۆیە دەڵێت: «لە سپارتەدا جۆرێك لە هاوسەرگیریی تاکەکەسی هەبوو، دەوڵەت دەستکاری کردوە و ڕێکی خستووە، بۆ ئەوەی لەگەڵ دۆخی باودا بڕوات، ئەم هاوسەرگیرییەش بوو کە زۆر تایبەتمەندی هاوسەرگیریی سەرەتایی هەڵگرتبوو»[98]، زۆربەی مێردەکان قەبوڵیان بوو کەسانی تریش لەگەڵیاندا بەشداری بکەن، بەتایبەتیش ئاساییبوو براکانیان لە ژنەکانیاندا هاوبەشی بکەن[99]. "لیکۆرگۆس" گاڵتەی بەئیرەیی و مۆنۆپۆلکردنی ژنەکان دەهات، و دەڵێت: «سەخیفترین شت ئەوەیە خەڵکی گرنگی بە سەگ و ئەسپەکانیان بدەن و تەقەلا و ماڵی خۆیان سەرف بکەن تا بەهۆیانەوە بگەنە وەچەی نوێ، ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا ژنەکانیان دوورەپەرێز بهێڵنەوە بۆئەوەی بەتایبەت منداڵیان لە خۆیان بۆ بخەنەوە»[100].

سپارتەییەکان بە پیری ئامۆژگارییەکانی یاسادانەرەکەیانەوە چوون «بۆیە دەکرا چەند برایەك یەك ژنی هاوبەشیان هەبووایە، یەك کەس دەیتوانی هاوبەشی هاوڕێکەی بێت لە ژنەکەیدا ئەگەر خۆی ئارەزووی لەمە هەبووایە». پەرەگرافێکی پلوتارك هەیە دەگێڕێتەوە ژنی سپارتەیی «ئەو دۆستەی بە ناز و شۆخیکردنەوە دوای دەکەوت دەنارده لای مێردەکەی بۆ ئەوەی لەم بارەیەوە قسەی لەگەڵدا بکات»..[101].

ئەوەی سەیرە ئەنگلز دواتر دەڵێت: «زینا بە واتا ڕاستەقینەکەی بوونی نەبووە، واتە خیانەتی ژن لە مێردەکەی بێ ئاگاداری ئەو»... ئینجا ئەنجامگیریی دەکات «لەبەر هەموو ئەم هەلومەرج و دۆخانە ژن لە سپارتەدا لەنێو هەموو ژنە گریکییەکانی تردا خاوەنی پێگەیەکی ڕێزدار بووە»[102]. جیمس دۆنالدسۆنیش

دەگێڕێتەوە پیاوێك هەوڵیدا ژنێكی سپارتەیی قایل بكات بۆ ئەوەی بە مەرامی خۆی بگات، ئەویش پێی گوت: «كاتێك كچ بووم فێربووم گوێڕایەڵی باوكم بم، كاتێك بوومە ژن گوێڕایەڵی مێردەكەمم كرد، جا ئەگەر شتێكی وەهات لە من ئەوێت ئەوا پێویستە لەپێشدا مۆڵەت لەو وەربگریت»..[١٠٣].

ئەوانەی لەبارەی نەبوونی زینا لە سپارتەدا دەدوێن و پێیان وایە ژن بەم هۆیەوە خاوەنی "پێگەیەكی ڕێزدار" بووە ئەوە لەبیردەكەن كە ژنە مێرددارەكان لە ڕەوشێكی زۆر خراپتر و دارماوتردا بوون لە حاڵەتی زینا، ئەو پەیوەندی سێكسی لەگەڵ هەر كەسێك گرتووە كە مێردەكەی ڕەزامەندی لەسەری دەربڕیوە، یان لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەیدا كە بۆی ڕەوانە كردوون، كاتێك مێردەكەی لەمانەدا «نێرایەتی و گەنجایەتی و توانای خستنەوەی منداڵی بەهێز»ی تێیاندا بەدی كردوون، ئەوەتا بەهەمان شێوەی مامەڵەی مێگەل مامەڵەی لەگەڵ ژنەكەدا كردووە، كە سەرپەرشتیارەكەی دەیەوێت وەچەی چاكی بۆ بخاتەوە. ژنەكەیش ڕازیبوو خۆی بەدەست ئەم ڕەوشە دارزاوەوە بدات.

وێڕای ئەوەش دەبێت ڕەچاوی ئەوە بكەین ئەو هەڵوێستانەی مێرد كە ژنەكەی خۆیی دەخستە بەردەستی هاوڕێكەی یان میوانەكەی هەر هەموویان لە كۆمەڵگە سەرەتاییەكاندا باویان هەبووە، بەتایبەتیش كۆمەڵگەی ڕاووشكارەكان و پاشانیش كۆمەڵگە شوانكارییەكان، هەروەها لای عەرەبەكانیش لە جاهیلییەتدا سەرجێی بە كەل و پەل هەبووە..[١٠٤]. هەموو ئەوانە بەڵگەن لەسەر دواكەوتوویی كۆمەڵگەی سپارتەیی لەلایەك و ڕەوشی خراپی ژن لەلایەكی ترەوە. بە پێچەوانەوە ئێمە پێمان وایە ئەو حاڵەتی خیانەتانەی كە بۆنموونە لە ئەسینادا باو بوون —ئەگەرچی حاڵەتگەلێكی كەم بوون — بەڵگەیە لەسەر ڕەوشی پێشكەوتووتر و ئەرێنیتری ژن، چوون هیچ نەبێ لێرەدا ئەم دۆخە جۆرێك یاخیبوون بووە لە مێردەكەی یان حساب بۆكردنی وەك كەل و پەلی ماڵ :«بڕیاری خیانەتكردنی ژن لە مێردەكەی زۆربەی جار دەگەڕێتەوە بۆ ژێر دەستكردنی». ئادلەریش جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە خیانەتی

ژن لە مێردەکەی بەردەوام جۆرێك بووە لە تۆڵەکردنەوەی و بەگژداچوونەوە.. هەروەها ژن بەوەش بەرەنگاریی مێردەکەی بۆتەوە کە گوتوویەتی خۆ ئەو تاکە پیاو نییە لە جیهاندا، بۆیە دەتوانێت پیاوی وەها بدۆزێتەوە کە قەدری سحر و سەرنجڕاکێشییەکەی بگرن. هەروەها گووتوویەتی خۆ کەنیزەکی تۆ نیم.. تۆ خۆت بە زیرەك دەزانی، بەڵام من دەتوانم بتکەمە کەسێکی خەڵەفاو»..[١٠٥]. بەڵام ژنی سپارتەیی کرابووە ئاژەڵ و ڕەنگە ئاژەڵێکی دەشتەکیش، کە تەنیا تایبەت بوو بە وەچەخستنەوە و بەردەوامی بنەچە، کە دەکرا کابرایەکی بەهێز بە ئاگاداری و ڕەزامەندی مێردەکەی سەرجێیی لەگەڵ بکردایە تا منداڵی بەهێزی پێ بخاتەوە، ئەو دەشتەکی بوو «بەو واتایەی هەموو سیفەتێکی مێیینەیی ون کردبوو»، "لیکۆرگۆس" بە ڕاشکاوی ئامۆژگاری ئەوەی کردووە با کچان لە هەر سیفەتێکی بەدەستهێنراوی مێیینەیی وەك شەرم و چاوڕوو پاك ببنەوە، ئەوەش بۆئەوەی بتوانن بە ڕووت و قووتی لەبەردەم پیاواندا سەما بکەن[١٠٦].

وەك پێشتریش باسمان کرد ژن میهرەبانی دایکایەتی لەدەست دابوو، ئەی چی لەبارەی ئەو ژنەوە بڵێین کە واز لە لێدانی پیاوانی ڕەبەن ناهێنێت و وەك دیۆرانت دەڵێ «بۆ ئەوەی توندترین ئازاریان بدات»[١٠٧]. ڕاستییەکەی مرۆڤ ناتوانێ خۆی خۆی لە سەرسوڕمان ببوێرێت بۆیە یەکێك لە زانایانی پەروەردەزانی دەڵێت: «دایکی سپارتەیی لە چاودێریکردنی منداڵەکانیدا بە بەهرە و تواناکانی،ڕێگرتنیان لە گریان و گوزارشتکردن لە خۆیان بە تووڕەیی و ترسەوە، بەناوبانگ بووە، ئەو هەر لە منداڵییەوە ڕای دەهێنان بەرگەی برسێتی و ئازار بگرن بە بێ هیچ سکاڵا و بێزارییەك»..[١٠٨]. ئایا لە پەروەردەدا ئەمە بەهرە و چاودێرییە یان ئاکاری سەرەتایی و دڕندەییە...؟ ئایا لێرەدا جۆرێك لە دڵڕەقی سەرەتاییانە نابینینەوە کە شایەنی هەست و سۆزی دایك نییە؟

هەموو ئەمانەی باسمان کرد دووپاتی ئەوە دەکەنەوە کە سیستەم لە سپارتەدا بە نزیکەیی لێکچووی کۆمەڵگە سەرەتاییەکان بووە، هیچ بایەخێکی ئەوتۆ بە

ڕۆشنبیریی و فێربوون و ئەدەب نەدراوە ـــ ئەوەش لەکەیەکە ئەفلاتون لەم سیستەمەی گرتووە و بگرە میوزیکیش، کە ئەفلاتون بە پایەیەکی سەرەکی داناوە بۆ پەروەردەکردنی ڕۆح، تەنیا بۆ ڕێزلێنانی پاڵەوانەکان یان هاندان و وروژاندنی شەڕکردن بووە، بە کورتی «یاسا سپارتەییەکان جگە لە سەربازی ئازا و چاونەترس هیچی تریان بەرهەم نەدەهێنا، بەڵام ئەمە هێزی جەستەی کردە هێزێکی دڕندە و خراپەکار چونکە بە نزیکەیی هەموو توانا عەقڵییەکانی ئەکوشت».. [١٠٩]. بۆیە ئیزۆکرات ڕاستی لەبارەیانەوە گوتووە کە ئەوانە لە بەربەرییەکان دواکەوتووتر بوون!.

بەڵام دۆخی ژن وەك گوتمان بێگومان لەژێر کاریگەری بوونی خاوەندارێتی لە کۆمەڵگەدا بووە، ئەمەش بە درێژایی مێژوو دەبینینەوە. قۆناغەکانی یەکەمی مرۆڤ کە هێشتا موڵکایەتی تاکەکەس (وەك کۆکردنەوە و بەرچنینەوە) تێیدا سەری هەڵنەدابوو، پیاو بۆی گرنگ نەبووە کە بە ژنێکی دیاریکراوەوە پەیوەست بێت[١١٠]. کاتێك سەروەت و سامان پەیدا بوو و لەگەڵیشیدا سیستەمی میرات هاتە کایەوە، پیاو بایەخی بە دڵسۆزیی ژنەکەی دا بۆ ئەوەی نەوەی لە پشتی خۆی بۆ بخاتەوە تا سەروەت و سامانەکەییان بۆ بگوزاێتەوە، خۆ ئەگەر موڵکایەتی دەستەکۆیی بووایە ئەوا ئەشیا هاوسەرگیریش دەستەکۆیی بووایە و خێزان بە واتا تەقلیدییەکەی هەڵبوەشایەتەوە ئەوەش ئەو دۆخەیە کە لە سپارتەدا هەبوو، لە سەدەی حەوتەمدا ﴿پێش زایین﴾ "لیکۆرگۆس"ـی گەورە یاسادانەری سپارتە سیستەمی خاوەندارێتی تاکەکەسیی زەوی هەڵوەشاندەوە و دیسان زەوییەکانی لاکۆنیای بۆ سی هەزار پارچەی یەکسان لە بەهادا و بەپێی ژمارەی خێزانەکانی ئەو کاتەی سپارتە دابەش کردەوە و هەر پارچە زەوییەکیشی دا بە خێزانێك تا لەڕێگەی کۆیلەکانەوە بەکاری بهێنن، کارێکی وەهایشی کرد کە دەوڵەت خۆی پشکێکی گەورەی لە زۆرینەی زەوییەکان و داهاتی خەڵکیدا هەبێت، ئەوەش لەبەرامبەر خەرجی هەموو ئەو کار و بارانەی پەروەردە و کارە جەنگییانەدا کە خستبوویە ئەستۆی خۆیەوە.. پاشانیش موڵکایەتی تاکەکەسی و خێزانی بە مانای وردی وەها کە باوك بەرپرسیارێتی تەواوی بەسەریدا

هەبێت لە ئارادا نەبوو، زەینەفۆن دەڵێت "لیکۆرگۆس" دژایەتی ئەو حاڵەتەی کردووە کە لە شارەکانی تردا باوبوون کە تێیاندا باوك باڵادەستی بەسەر منداڵەکانی و نۆکەرەکانی و ماڵ و موڵکەکەیدا هەبووە. ئامانجی لەوەش مسۆگەرکردنی سەلامەتی هەموو هاونیشتمانیان بوو، ئینجا بڕوای وابوو دەبێت هەر هاونیشتمانییەك چۆن بەسەر منداڵەکانی خۆیدا باڵادەستە ئاوهاش باڵادەستی تەواوی بەسەر منداڵەکانی دەرو دراوسێییدا هەبێت.. خۆ ئەگەر لاوێك لای باوکی سکاڵای لەوە بردایە کە کەسێکی تر لە جێی باوکی بە قەمچی لێی داوە، ئەوا ئەو باوکە هەڵەی کردووە ئەگەر ئەویش لای خۆیەوە بە قەمچی تێی نەسرەوێنێتەوە، هەروەها لیکۆرگۆس بەکارهێنانی نۆکەرانی ماڵە دراوسێکانی بۆ ڕەوا کردوون، ئەم کۆمۆنەییەش سەگی ڕاو و تانجی و ئەسپ و شتەکانی تریشی گرتۆتەوە»..[111].

موڵکایەتی دەستەکۆیی و پەوەردەی دەستەکۆیی و هاوسەرگیریی دەستەکۆییش.

جێی سەرنجە مێردەکان خۆیان پێشوازییان لەوە دەکرد کە ژنەکانیان پەیوەندی لەگەڵ پیاوانی تردا بگرن، چونکە ئەوە ژمارەی نەوەکانی "زۆر" دەکرد، هەر کەسێك سێ منداڵی بخستایەتەوە لە خزمەتی سەربازیی دووردەخرایەوە، هەرکەسێکیش بیکردایە بە چوار بە تەواوی لێی بێ بەری دەکرا. ئینجا هیچ نەوەیەکیش زیانی نەبوو کە ژنەکە لە پیاوێکی تر بەرهەمی بهێنایە چوونکە هیچ شتێکی لە سامان و زەوی خێزانەکە بەرنەدەوت، وێڕای ئەوەی نەدەبوو ئەو زەوییە بفرۆشرێت یان دەستی لێ هەڵبگیرێت.

لەبەر هەموو ئەوانە ئێمە پێگەیەکی بەرز لە کۆمەڵگەی سپارتەییدا بۆ ژن نابینین، کە هەموو ئەدگارەکانی مێیینەیی لێ داماڵیوە و توندوتیژی و دڵڕەقی و زبریی تەنانەت لەگەڵ منداڵ و مێردی خۆیشیدا فێر کردووە بە جۆرێك کە هیچ شتێکی وەك ژن نەماوە جگە لە ئەرکی نەوەخستنەوە و بەردەوامی بنەچە! پاشانیش ئەم کۆمەڵگەیە نەیتوانی ئەم پێشەکییانە بگەیەنێتە دەرەنجامە لۆژیکییەکانی وەك ئەوەی ئەفلاتون لە دواتردا کردی، ئەگەر بەم شێوەیە ژن گۆڕابێت بۆ پیاو ئەی چی

ڕێگر بوو لە بەشداریکردنی لە ڕێکخستنە سیاسییەکاندا؟ ئەی بۆچی ئەوان سفرەی هاوبەشی شێوانیان نەبووە یان بەشدارییان لە خوانی پیاوانیان نەکردووە؟ ئەمەش لەکەیەکی ترە کە فەیلەسوفەکەمان لە سیستەمی سپارتەیی دەیگرێت و سوورە لەسەر ئەوەی بۆ یەکەمجار لە "کۆمار"ەکەیدا و ئینجا دواتر لە "یاساکان"دا چارەسەریان بکات. ئەوەی بە هەق جێی تێبینییە ئەوەیە کە تاکە ژنێکیش چییە لە ئەنجومەنی پیراندا "گیرۆزیا"دا نەبووە ــ کە پێکهاتبوو لە هەردوو پادشاکە (سپارتە دوو پادشا بە حوکمی وەزیفەکانیان فەرمانڕەواییان تێدا دەکرد) و ٢٨ ئەندامی پیاو کە تەمەنیان گەیشتبووە شەست ساڵ و خاوەن فەزیلەت بوون.

نەك هەرر ئەوەندە، بگرە وا پێناچێت تاکە ژنێکیش هەبێت لە کۆمەڵەی گشتیدا APPELA کە پێکهاتبوو لە هەموو پیاوە هاونیشتمانییە سپارتەییەکان کە تەمەنیان گەیشتبووە سی ساڵان و ئەو قۆناغانەی مەشقییان بڕیبوو کە یاسا بەسەریدا سەپاندبوون، تاکە ژنێك لە نێو پێنج چاودێرەکە EPHORS شدا نەبووە کە کۆمەڵەی گشتی هەموو ساڵێك بۆ چاودێریکردنی بەرژەوەندییەکانی گەل و سەرپەرشتیکردنی سەربازگەکانی مەشقکردندا هەڵی دەبژاردن.

ماوەتەوە لە کۆتاییدا بڵێین کچ تەنیا بە ڕەزامەندی باوك بۆی هەبوو میراتی بەر بکەوێت، لە بەڕەتدا میرات بۆ کوڕەکان بوو، خۆ ئەگەر باوکەکە کوڕی نەبووایە ئەوا مافی ئەوەی هەبوو بە ڕازامەندی دوو پادشاکە لە کەسێکی تر تەبەنی کوڕان بکات، یاخود میراتەکە بۆ کچەی جێ بهێڵێت بیدات بە شوو بە پیاوێك بە ویستی خۆی (واتە باوکەکە) یاخود ئەمە بکاتە ڕاسپاردە (وەسێت) تا دوای مردنی خۆی بەشووی بدات، خۆ ئەگەر بمردایە و وەسێتی نەبووایە ئەوا وەسێتگرەکەی بۆی هەبوو بە ویستی خۆی بیدات بە شوو یاخود بیکردایە بە ژنی خۆی[١١٢]، وەك گوتیشمان باوك بۆی هەبوو تەبەنی بکات یان سامانەکەی بۆ هاوڕێیەکی جێ بهێڵێت، خۆ ئەگەر ئەرستۆ دەڵێت «پێنج بەشی زەوییەکان لە سپارتەدا لە ڕۆژگاری ئەودا موڵکی ژنان بوون چونکە ژمارەیەکی زۆر لەوانە تاکە میراتگر بوون»[١١٣]، ئەوا "جۆنز" وایدەبینێت

"ئەرستۆ" مەبەستی لە ژنەکانی سپارتە ئەو بێوەژنانەیە کە لە کۆتاییدا مارەیی خۆیان وەرگرتۆتەوە»[114]. مارەیی ماڵی کچەکە دەیاندا پێی، هەتا ژنەکەی لای بمایاتەوە ئەو مارەییە لای مێردەکە دەمایەوە و بەکاری دەهێنا بێ ئەوەی خەرجی بکات یان بیفرۆشێت، خۆ ئەگەر تەڵاقی بدایە ئەوا لەگەڵ مارەییەکەی دەگەڕایەوە بۆ ماڵی باوکی یان وەسێتگرەکە. لەبەرئەمە مارەیی بڕێکی زۆر بووە.. ئەمەش ئەو هۆکارەیەکە کە وەك دەبینین وای لە ئەفلاتون کردووە لە یاساکاندا داوای هەڵوەشانەوەی بکات، هەروەها وای لە ئەرستۆ کردووە بڵێت «باشتر وابوو مارەیی هەرگیز نەبووایە یاخود بڕێکی کەم یان ماقووڵ بووایە»[115].

# بەشی یەکەم

## ژن لە دیالۆگی کۆماردا

**دەستپێك:**

کتێبی یەکەم لە دیالۆگی کۆمار بە پێناسەکردنی فرەڕەنگی عەدالەت دەستپێدەکات و تەواو دەبێت، بەڵام کتێبی دووەم لە عەدالەت لە تاکدا دەمانگوازێتەوە بۆ عەدالەت لە دەوڵەتدا، بەو پێیەی دووەمیان وێنەیەکی گەورەکراوی یەکەمیانە و ئینجا بۆ ئێمە ئاسانە دەرکی بکەین (٢٦٨ ــ بەرگی ٢ لا ٢١٠)[١١٦]. لێرەدا ئەفلاتون دەست دەکات بە توێژینەوە لە پەیدابوونی دەوڵەت، ئەو ئاگاییەکی تەواوی بەوە هەبوو کە بنچینەی کۆمەڵبوونی مرۆیی و بنەڕەتی ڕاستەقینەی پەیدابوونی دەوڵەت "پێویستی" یان بێ توانایی تاك بووە بۆ خودکەفایی، بەتایبەتیش لە بابەتە پێویستییەکانی وەکو خۆراك و پۆشاك و ماڵ (٢٦٩هـ ــ ص٢١). تێرکردنی ئەم پێویستییانە بە تاکە کەسێك ناکرێت، بەڵکو پێویستە کار دابەش بکرێت بۆ ئەوەی هەر کەسەو بە ڕێك و پێکی کارەکانی خۆی جێ بەجێ بکات، ئەوەش وا لە تاك دەکات تەنیا بە یەك کارەوە بەسترابێتەوە، هەیە تەنیا کشتوکاڵ ئەکات، هەیە گاسن و جەنجەڕ بۆ ئەو دروست دەکات، هەیە شوانی مانگا و گاجووتە کە ئەم گاسنە ڕادەکێشن (٣٧٠هـ ــ لا٢١٢)، هەیە پێڵاو دروست دەکات ، هەیە ماڵ بنیات دەنێت وهەیشە کرێکاری ئەکات...هتد. هەروەها پێویستە لەپاڵ جووتیار و پیشەوەر و شوان و کرێکگرتەدا ــ بازگان و هێنەر و نێرەر هەبن، کە کاری بازاڕداری بە بەرهەمە ناوخۆیی و دەرەکییەکانەوە بکەن و..هتد. لە هەموو کۆمەڵگەکاندا ڕێسایەکی سەرەکی هەیە، ئەویش بوونی چینی بەرهەمەهێنەر

یان کرێکار و چینی خزمەتگوزارەکانە ــ خۆ ئەگەر لەم دۆخەدا بوەستین ئەوا "کۆمەڵگای شەهوەت"مان هەیە کە خوێ و زەیتون و پەنیر و سەوزە و میوەی تێدایە ــ هەروەها هەموو ئەو خۆراك و پۆشاکانەیش کە مرۆڤ پێویستی پێیانە. بەڵام ئەو ژیانەی بەوەندە وازدەهێنێت و قەناعەت دەکات ئەوە نزیکترە لە "ژیانی بەرازەکان"ـەوە! خۆ ئەگەر دەوڵەتەکەمان وەها دامەزرێنین ئامانجی ئەم کاروبارانە بێت ئەوا «وەك ئەوەیە شاری بەرازەکان رێك بخات» (٣٧٢د ــ لا١٥٢) ئەمە لە دەروونێکی شەهوەتباز ئەچێت کە ئەرکی خۆی تەنیا لە تێرکردنی جەستەدا دەبینێتەوە. بەڵام دوای ئەوە ئێمە پێویستمان بە پاراستنی شارەکەمان و کەسێکە کە فەرمانڕەواییەکەی هەڵسوڕێنێت. خۆ جووتیار و وەرزێر و پیشەوەرەکانیش ناتوانن ئەم کارە بکەن بۆیە، وەك گووتمان، «پێویستە هەر تاکێك شارەزایی لە یەك ئیشدا پەیدا بکات». بەم جۆرە دەبێت چینێکی تر دەبکەوێت ئەویش چینی سەربازەکانن —و لەمانیشەوە چینی فەرمانڕەواکان دروست دەبن ــ لە نزیکەی کۆتایی کتێبی دووەمدا بۆ یەکەمجار ئەفلاتون گوزارەی "پاسەوانەکان" بەکار دەهێنێت بۆ دەلالەت کردن لە هەردوو چینەکە پێکەوە. ئەم پاسەوانانە پێویستیان بە پەروەردەیەکی توند هەیە، چوون جەنگ هونەرە (٢٧٤ب ــ لا٢١٧)، کەسێك لەسەری ڕانەهێنرا بێت ناتوانێت بیکات، دەبێ کەسێك بێت بزانێت چۆن لەسەرخۆیی و نەرم و نیانی لەگەڵ هاونیشتمانییەکانی و توونودتیژی لەگەڵ دوژمنەکانیدا پیشان دەدات «وەك ئەوسەگە ڕەسەنەی کە ئێجگار هێمن و لەسەرخۆیە دەرهەق بەو کەسانەی هۆگریانە و دەیانناسێت و بە پێچەوانەشەوە دەرهەق بەو کەسانەی نایانناسێت» (٣٧٥أ ــ لا٢١٨). بەڵام پاسەوانەکان وێڕای ئەمەش دەبێت بۆ ئەم گوڕوتینە لێوڕێژە سیفەتەکانی فەیلەسوفیش کۆ بکەنەوە «کە لەسەر بنەمای مەعریفەت هاوڕێکەی لە دوژمنەکەی جیادەکاتەوە». کتێبی دووەم بەپێی گوتەی ئەفلاتون بە "چیرۆکی فێرکردنی پاسەوانەکان" دەست پێدەکات، «مەشقە وەرزشییەکان بۆ جەستە و

میوزیك بۆ دەروون».. ئەمە لە لە پەروەردەی کولتووری ئەسینایی سەردەمی ئەفلاتوندا دابەشکردنێکی باو بوو.

## یەکەم: موڵکایەتی و.. خێزان:

لە کتێبی سێیەمدا ئەفلاتون درێژە بە قسەکانی دەدات لەبارەی پەروەردەی پاسەوانەکانەوە، چینی سەربازەکان کە بەرگری لە شار دەکەن و دەستەبژێری فەرمانڕەوا کە لە هەناوی دەستەی یەکەمەوە دێنە دەرێ[117]، یان چینی فەرمانڕەوا و هاوکارەکانیان. پاسەوانەکان چۆن وەها پەروەردە بکەین کە "پیاوانی مەزن"ـیان لێ دەربچێت؟ دەبێت ڕژێمێکی ورد و پتەو دابڕێژرێت تا زۆرێك لەو ڕەگەزە سپارتەییانەی تێدا بێت کە توانایەکی بەرزیان لەو جەنگانەدا پیشان داوە کە لە ساڵی (٤٠٤ پ. ز) بوونە هۆی بەزینی ئەسینا[118]. بەڵام دەبێت چارەسەری ئەو کەم و کورتییانەش بکرێت لە ڕژێمی سپارتەییدا هەیە و جەستە و دەروون پێکەوە پەروەردە بکرێن. هەر لە سەرەتایشەوە لەسەرمان پێویستە ئاگامان لە چەند خاڵێك بێت بۆئەوەی پەروەردەکە فاسد نەبێت.

### خاڵی یەکەم:

ئەوەیە ئێمە «لەسەر هەق دەبین ئەگەر گریان و شیوەنمان لە پیاوان دوورخستەوە و لێگەڕاین بۆ ژنان»..(٣٨٨ ــ حـ٢ ــ ٣٢٢٧)، ئەوەش بۆئەوەی ئەو کەسانەی لەپێناو پاسەوانیکردن لە دەوڵەتدا پەروەردەیان دەکەین ڕابێن لەسەر ڕقبوونەوە لە لاوازی و بێ ورەییەکی لەم جۆرە.

### خاڵی دووەم:

جۆرێکە لە پاراستن «ئەوانەی بەلامانەوە مەبەستن و کار بۆ چاندنی فەزیلەت لە دەروونیاندا دەکەین، ئەوانەی بەر لە هەر شتێك پیاوانن[119]، لێناگەڕێین لاسایی ژنی گەنج یان پیربکەنەوە و لەگەڵ ژنیاندا توندیژ بین، یان لە غرور و شانازی بە خۆکردندا بەربەرەکانێی خواوەندەکان بکەن، یان بۆ بەختی ڕەشیان بگرین و زوو زوو بیکەنە شین

و شەپۆڕ، جێی مشتومڕیش نییە ناهێڵین لاسایی ژن بکەنەوە کاتێك نەخۆشە، یان خۆشەویستی دەکات، یان منداڵی دەبێت»..(۳۹٥أ ــ بەرگی ۲ لا ۳٤۲). وا پێدەچێت ئەم دەقانەی کە ئەفلاتون پەروەردەکردنی پاسەوانەکانی پیێ دەست پێدەکات هەندێك سەیر و سەمەرەیە، ئەو بەر لەوەی بەرنامە پەروەردەییەکەی خۆی بخاتە ڕوو لە پێویستبوونی دوورخستنەوەی ڕەگەزە "ژنانەکان" هۆشداریمان پیێ دەدات، ئێمە بەر لە هەموو شتێك پیاوانمان دەوێت، بۆیە قەبووڵی کەسێك ناکەین لاسایی ژنان بکاتەوە! ئێمە دەپرسین چۆن دەکرێت ئەم دەقانە لەگەڵ ئەو وتانەی لەبارەی "یەکسانی پیاو و ژن"ــەوە دەگووترێن و دەدرێنە پاڵ ئەفلاتون یەك بگرنەوە؟ پێش وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئەکەوین گەر بڵێین ئەفلاتون وەك پاسەوانی ئایدیالیی شاری نموونەیی وێنەی "پیاو"ی بە زەینیدا هێناوە ، جا بۆیە یەکسانی لە خۆیدا مەبەست نەبووە، بەڵکو بەرەنجامێکی لۆژیکییە و پەیوەندی نییە بە ڕزگارکردنی ژنانەوە، لێرەشدا ئەگەر ژنان بچنە ڕیزی پاسەوانەکانەوە ئەوا دەبێت ژنانێکی "بە پیاو بوو" بن، ئەگەر ئەم گوزارەیە دروست بێت، بە جۆرێك لە هەموو ئەو سیفەتانە ڕەها بووبن کە پێیان دەڵێین "خەسڵەتە ژنانەکان"، هەروەها نابێت ئەوە بەسەریاندا زاڵ بێت کە بەسەر ژندا زاڵە، مەبەست لەمەش هەڵچوونی توندە کە لە دۆخەکانی غەمگینییدا دەگۆڕێت بۆ شین و شەپۆڕ. ئێمە پیاوانێکی توندو زبرمان دەوێت، وەك ژنانێکی بەهێز و خۆڕاگر (جوامێر)مان ئەوێت. دەبێت ئەوە بە زەینی خۆماندا بێنین کە "نێتەلشیپ" لێمانی ئاگادار دەکاتەوە لەوەی وشەی جوامێریی یۆنانی واتا حەرفییەکەی مانای "پیاوەتی"ــیە[120].

لەمەوە ڕوون دەبێتەوە ئەفلاتون دەیەوێت پاسەوانە کوڕ و کچەکان هەر لە منداڵییەوە لەسەر "پیاوەتی" واتە لەسەر جوامێریی، پەروەردە بکات. ڕاستییەکەی چارەسەری ئەفلاتوون بۆ بابەتی جوامێریی بە تەواوی چارەسەرێکی یۆنانییە، ئەو منداڵەی ڕۆژێك لە ڕۆژان دەبێتە سەرباز و لەپێناو وڵاتەکەیدا شەڕ دەکات، دەبێت بەر لە هەموو شتێك فێر بێت لە مردن سڵ نەکاتەوە. خۆ ئەگەر بزانین مەرگ لای گریك

کۆتایی گەنجی و لاویی و جوانییە و سەرەتای چوون نێو جیهانی تارمایی و غەمەکانە، ئەوا دەشزانین مەرگ لای ئەوان لە شتە زۆر تۆقێنەرەکانە و هەر کەسێك بێ ترس و سڵەمینەوە ڕوبەڕووی ببێتەوە ئەوا تەنیا ئەو شیاوی ئەوەیە پێی بووترێت پیاو.[121] واتای ئەمەش ئەوەیە ئەفلاتون ــ وەك لیکۆرگۆس پێشتر بانگەشەی بۆ کردووە ــ دەیەوێت لە میانی پەروەردەدا کچ لە هەست و سۆزە مێینەکان ڕزگاری ببێت، تا بتوانێت بچێتە ڕیزی چینی پاسەوانەکانەوە.

**خاڵی سێیەم:**

ئەوەی کە پێویستە زۆر باش ئاگامان لێی بێت ئەوەیە کاتێك ئەفلاتون پێشەکییە گشتییەکان بۆ ڕژێمی پەروەردەکەی دادەنێت، وەك بینیمان لەوە ئاگارمان دەکاتەوە لێ نەگەڕێین پاسەوانەکان لە ژن بچن، یان شێوازیان لە شێوازی مێینە بچێت، چوون ئەو زۆر ڕقی لەم شێوازە بووە ــ بەڵام دەشڵێت: «هەروەها دەبێت لاسایی کۆیلەکانیش نەکەنەوە، چ نێر بن یان مێ، لە دۆخی کۆیلایەتییاندا».. پاشان زیاتر دەڵێت «مەحاڵیشە لاسایی خەڵکانی خراپەکار و ترسنۆك و شتێتەکان بکەنەوە، نە لە کردارییاندا و نە لە گفتاریاندا»..(٣٩٦ ــ لا ٢٤٢) ــ بە ئاسانی دەتوانین تێبینی ئەوە بکەین ئەفلاتون لە وتەکانیدا هەمیشە ژنان لەگەڵ کۆیلەکان و منداڵان و خراپکاران و پیاوە سەرشێتەکاندا، یان لەگەڵ ئاژەڵان و مێگەلدا پۆلێن دەکات..هتد[122]. ئەو لەبارەی ژنەوە وەك مێینە بە هیچ هاوسۆزییەك قسە ناکات، پاش کەمێکی تر ئەگەڕێینەوە بۆ ئەم بابەتە.

دوای ئەم ئاگادارکرنەوانە ئەفلاتون بەرنامە پەروەردەییە بەناوبانگەکەی بۆ بونیاتنانی جەستە لەلایەك و مەشقەکان بە دەروون لەلایەکی دیکەوە دادەنێت، ڕاهێنانە وەرزشییەکان پێویستن بۆ بیاتنانی جەستە و میوزیکیش بنەمایەکی بنەڕەتییە بۆ پەروەردەکردنی دەروون و ئەمەشیان گرنگترە، چونکە جەستە هەرچۆن بونیادەکەی بەهێز بێت ناتوانێت وا لە دەروون بکات چاك بێت. بەڵام دەروونی چاك دەتوانێت بەهێزە شاراوەکەیەوە کەماڵ بۆ جەستە زیاد بکات (٤٠٣أ ــ لا ٢٥١). خۆ ئەگەر

دەروون دوو دانە ژێی فەلسەفە و جوامێریی هەبێت، ئەوا هەردووکیان پێکەوە هارمۆنیا و تەبایی دروست دەکەن. ژێی جوامێریی میوزیك خاوی دەکاتەوە و وەرزشی بەدەنی توندی دەکاتەوە، بەڵام ژێی فەلسەفە میوزیك توندی دەکاتەوە و وەرزش خاوی دەکاتەوە (٤١٢ ــ بەرگی ٢، لا ٢٦٢) — چارەسەری کەم و کورتی لە پەروەردەی سپارتەدا واتە بایەخدان بە هەردوو ژێیەکە پێکەوە. خۆ ئەگەر هێشتا فەیلەسوفەکەمان بە توندی پەیوەست بێت بە پەروەردەی سپارتەوە کە لە میتافیزیکاکەیدا دەستی بۆ ژێیەکی هەستەوەر بردووە، ئەوا پێویستە منداڵەکانمان لەسەر "ژیانی زبر"، و خەڵوەت ڕا بێنین و بیانخەینە بەر کاری نارەحەت و جەنگی قورس و هەر لە چکۆلەییشەوە بیانخەینە نێو شتانێکی ترسناکەوە و بە تاقیکردنەوەی لەوەش قورستر کە ڕۆیشتنە بە نێو ئاگردا، ڕایان بێنین (٤١٣ ــ لا٢٦٣) ئەم جۆرە لە پەروەردە تەبایە لەگەڵ ڕقی ئەفلاتون لە جەستە لە لایەك، لە لایەکی دیکەیشەوە تەریبە دەڕوات لەگەڵ ئەو دۆخەدا کە لە سەرجەمی شارە یۆنانییەکاندا باو بووە، ئەویش ئەو بنەما سەرەکییەیە کە دەڵێت دەبێت تاکەکەس لە پێناو دەوڵەتدا قوربانی بدات بە بەرژەوەندییە تایبەتەکانی و "خۆ خۆشویستن". بگرە ئەفلاتون پێی وابوو ئەو کێشە سەرەکییەی کە لە دروستکردنی شارە فازڵەکەماندا دووچاری دەبینەوە بریتییە لە"زێدەڕەویکردن لە خۆ خۆشویستندا" کە لە هەموو دۆخێکدا هۆکاری بەڵا و نەگبەتییەکانە و ئەوەش هەڵەیەکی کوشندەیە و "بگرە لە هەموو هەڵەکان کوشندەترە"، ئەم هەڵەیەش گەرای لە دەروونداندا خستووە و مرۆڤیش هەوڵدەدات بەهۆیەوە لەخۆڕازی و خۆ ویست بێت بێ ئەوەی بیەوێت ڕاستی بکاتەوە، هەروەها هەڵەیەکە ئەو بنەمایە گوزارشتی لێدەکات کە دەڵێت: «هەموو مرۆڤێك بە سروشتی خۆی هاوڕێی خۆیەتی و دەبێت هەر بەو جۆرەیش بێت»..(٧٣١هـ ــ لا٣٠٠) ئەوە ئەو زێدە نەرگسییەیە کە دەبێت پاسەوانەکانمانیان لێ پاك بکەینەوە و وا پەروەردەیان بکەین بەرژەوەندییە کەسییەکانیان لە خۆیان دابماڵن و ئیدی جگە لە بەرژەوەندی دەوڵەت هیچ بەرژەوەندییەکی دیکە لە گۆڕێدا نەبێت».

له فێرکردنی پاسەوانەکان تەواو بووین: ئەی ئەمانە لە کوێ نیشتەجێن؟ «بیرکردنەوەی دروست ناهێڵێت نشینگە و ماڵ و موڵکیان بۆ هەڵبژێرین چونکە ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت ئەوان وەك پاسەوان نەگەیشتوونەتە ڕادەی کەماڵ» (٤١٦عـ بەرگی ٢ لا٢٦٧). ئەوەتا لێرەدا ئەفلاتون بۆ یەکەمجار —وەك تەباییەك لەگەڵ بنەما میتافیزیکی و ئەخلاقییەکانیدا کە ڕقی لە مادەیە و لە سەنگی دێنێتە خواریّ ــ موڵکایەتی تایبەت لە "چینی پاسەوانەکان" حەرام دەکات «کە بۆ هیچ یەکێکیان نییە خۆی بە تەنها شتێکی هەبێت، هیچ یەکێکیان بۆیان نییە ماڵ و نشینگەیەکی وای هەبێت کە کەسانی تر نەتوانن بێنە نێوییەوە» (٤١٦عـ ــ بەرگی دووەم، لا٢٦٧). کاتێکیش ئەفلاتون لەبارەی "سەربازگەی دەروازە ئاوالاّ"وە دەدوێت کە دەبێت ئەم پاسەوانانە تێیدا بژین، بە ئاشکرا کاریگەر سپارتەی بەسەرەوە دەردەکەوێت «دەبێت پێکەوە ژەمەکانیان بخۆن و وەك سەربازیش لە مەیدانەکانی جەنگدا بە کۆمەڵ بژین».. هەروەك سپارتە ئەویش بەخۆوەکردنی زێڕ و زیویان لێ قەدەغە دەکات —ئەم حەرامکردنە لە دیالۆگی "یاساکان"یشدا هەر بەردەوام دەبێت ــ چونکە لەوە دڵنیایان ئەکەینەوە بە بەردەوامی لە ناخ و دەروونی خۆیاندا زێڕ و زیوی خۆیانیان هەیە کە خودا پێی بەخشیون. بۆیە پێویستیان بە زێڕ و زیوی خەڵکیی نییە، نەنگی و عەیبەیشە ئەو زێرە خوداییەی هەیانە بە تێکەڵکردنی زێڕی زەمینی پیسی بکەن ــ «چونکە ئەو زێڕەی خەڵکی عەوام کێبەرکێ و هەڵپەی بۆ دەکەن ئەنگێزەی خراپەیەکی بێ پایانە، ئەمە لەکاتێکدا ئەو زێڕەی لە ناخیاندا پەنهانە لە مەعدەنێکی پەتییە و تەنیا ئەوان نەك هاونیشتمانیەکانی تر دەبێت ماڵ و سامان کۆنەکەنەوە و پێویستیان بە زێر نەبێت یاخود نابێت ئەوان و زێڕ لە ژێر یەك بان-دا کۆ ببنەوە..هتد» (٤١٧أ ـــ ب بەرگی ٢ لا٢٦٨). ئەگەر ئێمە بمانەوێت هاونیشتمانیان تا بەزترین ئاستی فەزیلەت بەرز بکەینەوە، ئەوا دەبێت ڕەچاوی سێ بوار بکەین کە مرۆڤ بایەخیان پێدەدات، نزمترین و کەمترینیان: ڕۆیشتن بەدوای ماڵ و ساماندا، ئینجا گرنگیدان بە جەستە کە دەکەوێتە قۆناغی ناوەندەوە، بەلاّم بەرزترینیان بریتییە لە بایەخدان بەتەنگەوەهاتنی دەروون.

ڕەوشی شارەکەمان ڕوو لە باشی ناکات تا ئەم ڕیزبەندییە ڕەچاو نەکەین (یاساکان ٧٤٣هـ ــ بەرگی ٢ ص٣١٢) ئینجا ئەگەر بمانەوێ بە ڕاستی پەروەردەی پاسەوانەکان بکەین ئەوا دەبێت شوێنکەوتنی ماڵ و سامانیان لێ دابماڵین. بایەخدانیشیان بە جەستە ئێجگار لەلا کەم بکەینەوە تا ئەو ڕادەیەی کە تەنیا شارەکە پێویستییەتی، جا چ ئەوەندەی بۆ ڕاهێنانی جەستە لەسەر شەڕ پێویستە، یان وەك ئامرازێك بۆ منداڵ خستنەوە، ژیانی ئەم چینە دەبێت ژیانێکی عەقڵانیانە بێت، عەقڵیش واتە خۆنەپەرستی، چونکە ئامانجی تێرکردنی خودیی نییە بەڵکو کار دەکات بۆ خۆشگوزەرانیی هەمووان[١٢٣]. (بەراورد بکە بە "کۆمار"یش ٤٨٥ حـ ــ هـ).

ڕاستییەکەی ئەفلاتون هێرشێکی توند ئەکاتە سەر کۆکردنەوەی سامان و سەروەتخوازی «شەهوەتی سەرکەشی خاوەندارێتی بنچینەی بەڵای هەموو دەوڵەت و تاکەکەسێکە».. (٢٧٣ ــ لا١٥٢)، تەنانەت خەریکە بگاتە ئەوەی پێمان بڵێت دەوڵەمەندەکان کەسانی خاوەن فەزیلەت نین، چوون ئەوانە دوو دژن بە یەکتر ناگەن، یان وەك ئەوەی فەزیلەت و سامان دوو جەمسەری دژ بە یەکیان لە یەکتر گرتبێت، هەرچەندەی مرۆڤ حەزی زیاتری لە سامان بێت و بەلایەوە گرنگتر بێت ، ئەوا لە فەزیلەت دوور دەکەوێتەوە و بایەخەکەی لای کەم دەبێتەوە «بە جۆرێك لەنێوان فەزیلەت و ساماندا فەرقێکی وەها هەیە کە ئەگەر بخرێتە تای تەرازوویەکەوە وا دەکات هەرچی چەندەی یەکێکیان دابەزێت ئەوی دیکەیان بەرز دەبێتەوە.. خۆ ئەگەر سامان و دەوڵەمەندان لە دەوڵەتدا ڕێزیان لێ بگیرێت ئەوا حەتمییە ڕێزی فەزیلەت و خاوەن فەزیلەتان ڕوو لە کەمییە».. (٥٥٠عـ ــ ٥٥١أ)، بێ گومان وەك گوتمان ئەم ڕقە لە ماڵ و سامان بەگشتی لەگەڵ میتافیزیکای ئەفلاتوندا تەبا و گونجاوە، بۆیە ئەو مادەی کرد بە ڕەگەزی خراپە لە گەردووندا، جەستەیشی سەرکوتکرد تا ئەوەی بە زیندانی دەروونی دایە قەڵەم.

کەواتە چارەسەری یەکلاکەرەوە چییە کە پاسەوانەکان بەدوور دەگرێت لە دابەزین بۆ ئاستی کۆکەرەوەی سامان؟ چی بکەین بۆ ئەوەی "خۆشەویستیی خۆڕسکانەی خود"

و زێدە خۆپەرستی زگماك لە دەروونی مرۆییدا لەنێوبەرین؟ چارەسەری لۆژیکی ئەوەیە هەر جۆرە موڵکایەتییەکی تایبەتی لیێ قەدەغە بکەین: نە ماڵ و نە خانوو و نە زەوی و نە زێڕ و نە زیو، نە موڵکی منن و نە موڵکی تۆ. «ئایا خراپە لە دەوڵەتدا هۆی لێك ترازانی یەکێتییەکەی نییە و پەرش و بڵاوی ناکات؟ باشترین چاکەیش تێیدا ئەوە نییە کە پارچەکانی کۆدەکاتەوە و دەیانکاتەوە بە یەك؟.. ئەوەی یەکێتی دەوڵەت هەڵدەوەشێنێتەوە خۆپەرستییە لە خۆشی و خەمەکاندا، لێرەوە هەندێ خەڵکی لە خۆشیدا تێر دەبن و هەندێکی تریش لە مەینەتی.. دروستبوونی ئەم فەرقە لە نێو خەڵکیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەوان لە کۆمەڵگەدا وشەگەلی "موڵکی منە" و "موڵکی من نییە" و "بۆ خەڵکی تر" و "بۆ خەڵکی تر نا" بۆ یەك شت بەکار ناهێنن (٦٥٢د ـــ حـ بەرگی ٢ لا٣١٨)، خۆ ئەگەر بتوانین موڵکایەتی تایبەت لەنێوبەرین، ئەوا دەگەینە باشترین کۆمەڵگەی وەها ئەو ئایدیا کۆنە فیساگۆرییەی لەسەر دەچەسپێ کە دەڵێت «موڵکایەتی شتەکان لەنێوان هاوڕێیاندا هاوبەشن»[١٢٤].

جێبەجێکردنی ئەم بنەمایە لەسەر چینی ژێرەوە کە ڕەگەزی شەهوەت بەسەریدا زاڵە و بە هەستەوە لکاوە و لە مادەوە نزیکە و ئینجا بایەخ بە جەستە و پێداویستییەکانی و غەریزەکانی و تێرکردنیان و..هتد دەدات کارێکی زەحمەتە، لەم دۆخەدا وا باشترە لێگەڕێن ئەم چینە خاوەنی زەوی و خانوو و ژن و..هتد بێت. ئەگەرچی دەبێت ئەم دۆخە لەژێر چاودێرییەکی توندی دەوڵەتدا بێت[١٢٥]. بەڵام ئەو چینەی پێشڕەوی کۆمەڵگا دەکات و بەرەو فەزیلەت ڕێنمایی دەکات، کە بەر لە چینەکانی تر بۆمان گرنگترن، (چینی فەرمانڕەوا و هاوکارەکانیانن)، ئەگەر داوا لە ئەندامەکانی ئەم چینە بکرێت خۆیان تەرخان بکەن بۆ بەجێهێنانی ئەرکە تایبەتەکان، ئەوا دەبێت واز لە ڕەگەزی شەهوەت بهێنن و تێیاندا ڕەنگ نەداتەوە، بەڵکو لە چینی خوارەوەدا و بە شێوەیەکی گشتی لەنێو چینی کرێکاران و جووتیاران و بەرهەمهێنەرەکاندا ڕەنگ دەداتەوە، هەر لەبەرئەمەش مەحاڵە لایەنی ئابووریی لە ژیان بکەنە دەرەوە و ڕەگەزی شەهوەتیش هەر لەم لایەنەدا خۆی دەنوێنێتەوە[١٢٦]. خۆ

لەبەرئەوەی فەزیلەت و سامان پێکەوە کۆنابنەوە ئەوا دەبێت کەسانی خاوەن فەزیلەت لایەنی ئابووری و لایەنی مادی کۆنەکەنەوە، بەڵکو دەبێت ئەو هەستە قێزەونە لە ناخ و شعوری ئەو پاسەوانانەدا دەربهێنین کە "ئەمە موڵکی منە" و "ئەوەش موڵکی تۆیە، چونکە ئەمە شعورێکە فەرق و فروق و کینە دەخاتە نێو خەڵکییەوە و کارێکی وا بکرێت هەر شتێك شیاوی خاوەندارێتی بێت لەنێوان تاکەکانی ئەم چینە هەڵبژێردراوەدا بکرێتە هاوبەش «ئەوەش لەبەرئەوەی ئەگەر وەك خەڵکانی تر ماڵ و سامانیان هەبێت ئەوا لە پاسەوانەوە دەبوونە بازرگان و وەرزێر، لە پارێزەری شارەوە دەبوونە ستەمکار و دوژمنانی شارەکە». (٤١٧ د ــ ٢٦٨لا).

بەم جۆرە ئەفلاتون بەو دەرەنجامە گەیشت کە پێویستە بەرژەوەندییە "خودییە نەرگسییەکان"ی ئەو چینەی کاروباری —شەڕ و ئاشتی ــ و بەرگری و سیاسەت لە دەستی خۆیدا کۆدەکاتەوە، لەنێو ببرێن، ئەو وای لە تاکەکان کردووە بە شێوەیەکی زبری خەڵوەتگەرایانە بژین کە سەرباری پەروەردەکردنی دەروون ڕەگەزانێکی زۆری لە پەروەردەی سپارتەش تێدایە، چینی خوارەوەش لەسەریەتی خەرجییەکانی ئەم چینە دابین بکات»..

ئەفلاتون لە کتێبی چوارەمدا دەچێتەوە سەر تاوتوێکردنی بابەتی موڵکایەتی و حەرامکردنی چینی پاسەوانەکان لە موڵکایەتی، بەتایبەتیش ئەو دەرەنجامانەی کە لەم حەرامکردنەوە دەکەونەوە، لەبەرئەوەی یەکێك لە گوێگرانی سوکرات —ئەدیمانتۆس ــ «پێشگیری (إعتراض) لەوە دەکات بەوەی حەرامکردنی موڵکایەتی لە پاسەوانەکان دەبێتە مایەی دەرەنجامگەلێکی خراپ و بێزار و وەرزیان دەکات، چونکە لەو کۆمەڵگەی خۆیان بۆ خزمەتکردنی تەرخان کردووە شتێکی ئەوتۆ، واتە سوود بەدەست ناهێنن و وەك فەرمانڕەواکانی دەوڵەت خاوەنی کۆشکی بەرز و ناومالّی ڕازاوە و..هتد نین, سوکرات وەڵامدەداتەوە بەوەی ئامانجمان لە بنیاتنانی دەوڵەت خۆشبەختی گروپێکی دیاریکراوی هاونیشتمانیان نییە، بەڵکو دەستەبەرکردنی زۆرترین ڕێژەی بەختەوەرییە بۆ هەموو کۆمەڵگە. ئەگەرچی بەختەوەری وشەیەکی ئالۆزە و ئەو کات ئەو مانایەی ئێستەی نەبووە، بەڵکو ئەویش وەك عەدالەت واتای ئەو دۆخە بووە کە لە

هارمۆنیای هانیشتمانییانەوە کەوتۆتەوە[127]. هەر هاونیشتمانییەك بێ ئەوەی دەستبەرێت بۆ کاری ئەوی دیکە ئەو تاکە کارەی کردووە کە بۆی گونجاو بووە، ئەوەتا لێرەدا "زۆرترین چاکە" وەدی دێت و ئەمەش بیرۆکەیەکی سەنتەریی بووە لای ئەفلاتون ــ لەپاش ئەمانە ئینجا بەختەوەری لە ڕوانگەی ئەودا وەدی دێت، واتە بەرزکردنەوەی هاونیشتمانیان، لە ڕێگەی پەروەردەوە، بۆ بەرزترین ئاستی شیاوی فەزیلەت و حیکمەت[128].

لێرەدا گرنگ بۆ ئێمە ئەوەیە ئەفلاتون کاتێك (لە کتێبی چوارەمدا) تاوتوێی ئەو بەرەنجامانە دەکات کە دەشێت لە هەڵوەشاندنەوەی موڵکایەتییەوە بکەونەوەـ ئەوا بۆمبێکی هەڵداوە و بەمەش یەکێك لەو سێ شەپۆلە شۆڕشگێڕییە دەنوێنێتەوە کە بەر هەست و ئاوەزی کۆمەڵگەی ئەسینایی کەوتن ــ مەبەستیشم "هەڵوەشاندنەوەی خێزان"ــە. بەڵام زۆر تاتوێی ئەم بیرۆکەیە ناکات بەڵکو بەوەندە واز دەهێنێت بەخێرایی بڵێت: «ئەگەر پەروەردەی دروست دەروونی هاونیشتمانیانمان ڕۆشن بکاتەوە ئەوا دەتوانین بە ئاسانی هەموو ئەو کێشانەی بۆ ماوەیەکی کاتی لێیان گەڕاوین، چارەسەر بکەین. هەروەها کێشەکانی تریش وەك کێشەی بەدەستهێنانی ژن و هاوسەرگیریی و منداڵ خستنەوە، بەجۆرێك لەم کاروبارانەدا پەیڕەوی لەو ڕێسایە بکەین کە دەڵێت هەموو شتێك لەنێوان هاوڕێیاندا هاوبەشە».. (٤٢٣عـ ــ ٤٢٤أ بەرگی ٢ ع ــ ٢٧٤لا).

دەبێت زۆر باش ئاگاداری ئەوە بین لێرەدا ئەفلاتون تاوتوێی ئەم بەرەنجامانە دەکات کە لە هەڵوەشاندنەوەی موڵکایەتییەوە دەکەونەوە. خۆ ئەگەر بڵێین نابێت هیچ کەس لە پاسەوانەکان خاوەنی هیچ شتێك بێت ئەوا بەرەنجامە لۆژیکیەکە ئەوەیە کە "خێزان"ــیش بوونی نەبێت بە جۆرێکی وا هەر شتێك بۆ خاوەندارێتی دەست بدات دەکرێتە شتی هاوبەش لەنێوان هاوڕێیاندا. بارکەر دەڵێت: «خێزان پێویستی بە خاوەندارێتییە تا قەوارەی خۆی بپارێزێت.. لێرەدا هەڵوەشاندنەوەی ژیانی خێزانداریی لەنێو فەرمانڕەواکاندا بەرەنجامێکە لە داماڵینی موڵکایەتی تایبەتەوە دەکەوێتەوە و بگرە دەتوانین بڵێین بەرەنجامێکی حەتمییشە.. چوون ئەفلاتون پێی وابووە موڵکایەتی و

خێزان دوو کایەن هەر یەکێکیان پشت بەوی دیکەیان دەبەستێت»..[129]. ئەوەی لە زەینی ئەفلاتوندا بەڵگەیە لەسەر بوونی پەیوەندی لەنێوان ئەم دوو کایەدا دوو خاڵن، یەکەمیان ئەوەیە ئەفلاتون موڵکایەتی تایبەتی بۆ چینی بەرهەمهێنەر بە ڕەوا بینیووە و هاوکاتیش رێی داوە خێزان پێك بهێنن، وەك ئەوەی پێی وابووبێت ڕەوشی ژن لەنێو خێزاندا وەك کەیبانووی خێزان لە بەرەنجامی بوونی موڵکایەتی تایبەتەوەیە لە کۆمەڵگەدا، خۆ ئەگەر ئەم موڵکایەتییە هەڵبوەشێنرێتەوە ئەوا دەبێت خێزانیش هەڵبوەشێتەوە و لەمەشەوە "شتەکان" دەبنە هاوبەش لەنێوان هاوڕێیاندا، ئینجا ژنەکانیش (الزوجات) دەبنە هاوبەش لەنێوان پاسەوانەکاندا.

دووەمیان ئەفلاتون خۆی کاتێك لە دیالۆگێکی لە دوایین دیالۆگەکانیدا ــ واتە دیالۆگی یاساکان ــ موڵکایەتی تایبەت دەگەڕێنێتەوە، هاوکات پێکەوەنانی خێزانیش دەگەڕێنێتەوە، ئینجا جارێکی دیکە ژنیش دەبێتەوە "کەیبانووی خێزان" و خانمی ماڵ و پەروەردەکەری منداڵەکانی، وەك چۆن مریشك لە جوجەڵەکانی یان بەگشتی باڵندە لە بێچووەکانی بەرگی دەکەن، ئەویش بە هەمان شێوە. جێی خۆیەتی بڵێین ئەم پەیوەستییە لەنێوان موڵکایەتی تایبەت و خێزاندا لە سپارتەشدا هەبووە و لەوێش کە موڵکایەتی تایبەت "نیمچە دەستەجەمعی" بوو ئەوا هاوسەرگیریش نیمچە دەستەجەمعی بوو، "ژنەکەیش" هەر نیمچە دەستەجەمعی بوو. بۆیە ڕێپێدراو بوو هەر کەسێك لەگەڵی بنووستایە کە دەوڵەت بە باشی زانیبا، یان پیاوەکە خۆی پێی وابووایە ئەو کەسە "کەڵە پیاوێکە" و دەتوانێت منداڵی توندوتۆڵ بۆ کۆمەڵگە بخاتەوە..[130].

بەڵام لە ئەسینادا کە کۆمەڵگەی باوکسالاریی موڵکایەتی تایبەتی بە ڕەوا بینیبوو ئەوا باوك وەك شتەکانی دیکە "ژنێکی تایبەتی"ـیشی هەبوو.. بۆ خەڵکی نەبوو بیبینن و ڕێی چوونەدەرەوەی لە ماڵ، یان ڕۆیشتنی بە ڕێگەوباندا پێ نەدەدرا، مەگەر ئەوەی پەچەیەکی بە ڕوخساریدا بدایە تا خەڵکی بزانن موڵکی تایبەتە و توخنکەوتنی شیاو نییە. بە پێچەوانەی لەشفرۆش و کەنیزەکەکانەوە کە کرابوونە موڵکی گشتی و ئینجا ئەم مەرجەشیان بەسەردا نەسەپێندرابوو.

بەم جۆرەش ئەو توانی بڵێت هەر کاتێك موڵکایەتی تایبەتی هەبوو خێزانیش هەیە، «لەبەرئەمە چینە بەرهەمهێنەرەکان ماڵ و خێزانیان لەگەڵ موڵکایەتی تایبەتدا بۆ خۆیان هێشتەوە، ئەو هۆکارانەیشی کە وایانکرد موڵکایەتی هاوبەش تەنیا چینە فەرمانڕەواکانی بگرێتەوە هەمان ئەو هۆکارانە بوون کە بوونە مایەی ئەوەی هاوبەشێتی لە ژنەکانیشدا هەر ئەم چینە بگرێتەوە، چونکە ئەمە بەرەنجامێکە لە هاوبەشێتی موڵکایەتییەوە دەکەوێتەوە»[١٣١].

لەمڕۆدا ژمارەیەکی زۆری فەیلەسوفان بڕوا بەم پەیوەندییە بەهێزەی نێوان موڵکایەتی و خێزان دەکەن. ڕەسل دەڵێت «دوو کارکردی سەرەکی هەن بۆ دیاریکردنی خەسڵەتەکانی هەر کۆمەڵگەیەك، ئەوانیش سیستەمی ئابووری و سیستەمی خێزان.. خۆ ئەگەر منداڵەکانمان لە دایك و باوکیان سەند و وەك ئەوەی لە کۆمارەکەی ئەفلاتوندا هەیە دەوڵەت پەروەردەیان بکات ئەوا دەبێت دەوڵەت ڕۆڵی باوك بگێڕێت و لەمەشەوە یەکسەر دەوڵەت دەبێتە تاکە سەرمایەدار.. خۆ ئەگەر دەوڵەت ببێتە تاکە سەرمایەدار، ئەوا خێزان وەك ئەوەی پێی ئاشناین ناتوانێت بمێنێتەوە، خۆ ئەگەر ئەم بیرۆکەیە تا ئەوپەڕیشی درێژ ببێتەوە ئەوا هەر مەحاڵە نکوڵی لە بوونی پەیوەستییەکی بەهێز بکەین لەنێوان موڵکایەتی تایبەت و خێزاندا. ئەوەش پەیوەستییەکی دووسەرە و دەستیاوە و بگرە ناتوانین بڵێین یەکێکیان هۆکارە و ئەوی دیکەیان بەرەنجام»..[١٣٢].

بەم جۆرە ڕەسل لای خۆیەوە موڵکایەتی تایبەت و خێزان بە توندی لێك گرێدەداتەوە. ئەفلاتونیش بیست و چوار سەدە پێش ڕەسل هەمان شتی کرد و بگرە مکوڕتریش بوو کاتێك چەمکی موڵکایەتی تایبەتی بەو جۆرەی لە کۆمەڵگەی ئەسینابیدا باو بوو فراوان کرد و درێژیکردەوە تا موڵکایەتی ژنیش[١٣٣]. ئەوە لە ئەسینادا مافی باوك بوو و هەر ئەویش خاوەنی "تاکەکانی خێزان" بوو. ئەوەش ئاشکرایە ئەفلاتون زۆر موڵکایەتی شتەکان و موڵکایەتی کەسەکانی لە یەکتر دانەدەبڕی و بە ڕوونی ژنان و منداڵان لەنێو موڵك و ماڵەکاندا پۆلێن دەکات[١٣٤]. ئەفلاتون لە دیالۆگی "یاساکان"دا –لەو کاتەی هەست بە دڵتەنگی دەکات بەهۆی

شکستهێنانی پرۆژەی کۆمارەکەیەوە ــ و دوای ڕێدانەوە بە موڵکایەتی تایبەت و خێزان، دەڵێت «تا ئەوەی هەر یەکێکمان ژن و ماڵ و منداڵ و شتانی دیکەی هەبوو کە تاکەکان وەك موڵکی تایبەتی هەیانن.. ئەوا ئێمە پرۆژەکەمان وەك ئەوەی نەخشەڕێژیمان بۆی کردبوو، وەدی نایەت».. (یاساکان ٨٠٧ بەرگی ٤ لا ٣٧٤).

دەتوانین سووك و ئاسان سەرنجی ئەوە بدەین هێشتا ئەفلاتون ژنان بە شێوەی کۆمەڵگەی ئەسینایی پۆلێن دەکات، ئەو خۆی لەم کۆمەڵگەیەدا ژیاوە و پێیان وابوو ژنان جۆرێك لە موڵکایەتی تایبەتن. ئەو هیچ دوو دڵ نییە لەوەی لەبارەی «ئەو یاسایەی خاوەنداریێتی ژنان و منداڵان و فێکردنیان ڕێك دەخات» بدوێت (٤٥٣هـ ــ بەرگی ٢ لا ٣٠٧).

دەستەواژەی (هاوبەشێتی لە ژنان و منداڵان) کە ئەفلاتون بۆ وەسفکردنی سیستەمە پێشنیارکراوەکەی لەبارەی هاوسەرگیریی کاتییەوە زۆر بەکاری دەهێنێت ئاماژەکی دوورتری تێدایە لەبەرئەوەی دەکرێت بە وردی وەها وەسفی ئەو دیاردەیە بکرێت کە "هاوبەشبوونە لە پیاوەکان"ـیشدا، "گرۆپ"ـیش پێی وایە «هەڵەیە ناوی لێ بنرێت هاوبەشێتی لە ژنان و منداڵان چونکە ژن و مێرد لەسەر یەك بنەما دەوەستن و هەر بە خێراییش هاوبەشی لەنێوانیاندا نامێنێت»..[١٣٥].

ئەی بۆچی ئەفلاتون "هاوبەشێتی لە ژناندا بێ لە پیاوان" بەکار دەهێنێت؟ ئەفلاتون هەرگیز لەبارەی هاوبەشێتی لە پیاواندا قسەی نەکردووە ــ چوون ئەوە هاوبەشێتییەکە دەبێت لەهەمان چرکەساتی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریی تاك لایەنەدا دروست ببێت ــ چونکە هاوبەشێتی لە ژنەکاندا ڕووی دووەمی دوورخستنەوی موڵکایەتی تایبەت بوو بە هەموو جۆرەکانییەوە، ڕاستییەکەی ژنەکان بە دەستەواژەیەکی تری یاسایی ئاماژەیان پێ دەدرا ئەویش هاوبەشێتی لە موڵکدا بوو..[١٣٦].

وێڕای ئەوەی "گرۆپ" وەسفی ئەفلاتونی وەك پەیامبەری یەکسانی نێوان ژن و پیاو کردووە کەچی دەگەڕێتەوە و دەڵێت: «ئەفلاتون لەبارەی یەکسانییەوە دوواوە، بەڵام هەرگیز لە هاوسەردەمەکانی زیاتر هەوڵی نەداوە لە بایەخی پەیوەندی نێوان پیاو و ژن

بەرز بکاتەوە»[137].. پاشانیش بەردەوام دەبێت لە ڕوونکردنەوەی بیرۆکەکەی خۆی «ڕاستە ئەفلاتون جەختی لەسەر یەکسانی هەردوو ڕەگەزەکە کردۆتەوە، بەڵام شکستی هێناوە لەوەی وا ببینێت یەکسانییەکی لەم جۆرە، دەبێت سەنگێکی زیاتر لەوەی بە ژنانی چوار دەوری دەدرا بە ژن بدات و ئینجا دەبێت پەیوەندیگەلێکی نوێ و جیاواز لەنێوان هەردوو ڕەگەزەکەدا دروست بکات تا ئەو داواکارییە باڵایانە تێر بکات کە یۆنانییەکان لە خۆشەویستییاندا بۆ پیاوان هەوڵی تێرکردنیان دەدا»[138].

کەواتە ئەفلاتون وا لە هەر جۆرە موڵکایەتییەکی تایبەتی دەڕوانێت وەك ئەوەی «کار دەکات بۆ وێرانکردنی یەکێتی کۆمەڵگە (بەتایبەتیش دەستەبژێریی فەرمانڕەواکان) و ئەوەش بەهەمان شێوە ژن یان "هاوسەری تایبەتی"ـیشی دەگرتەوە، کێبەرکێ لەسەر ژنەکان هەست و ئاوەزی خراپی پیاوان بەهێز دەکات و دەبێتە هۆی لێك هەڵوەشان و وێرانکاریی چونکە ئەوە جۆرێکی تایبەتی موڵکایەتییە»[139]. جا هەر کەس لای خۆیەوە هەوڵ دەدات دەست بۆ هەر شتێك بەرێت کە بتوانێت بەدەستی بهێنێت تا بیخاتە نێو خانوویەکی تایبەت بەخۆیەوە کە ژن و منداڵەکانیشی تێدابوون و هەر ئەمانیش سەرچاوەی خۆشی و ناخۆشییەکانی بوون (٤٦٤حـ بەرگی ٢ لا ٣٢١)، بەڵام کاتێك ئیدی هیچ کەسێك موڵکی تاکەکەسیی نەماوە، هەموو شتێك ئەبێتە هاوبەش لەنێوان هەمووواندا، ئایا ئیتر کێشە و تۆمەتە هەمەلایەنەکانیش لای خۆیانە وە لەنێو ناچن، لە هەموو ئەو ناکۆکییانە دەرباز نابن کە لە ماڵ و پەیوەستییە خێزانییەکانەوە دەکەونەوە؟ (٤٦٤ ـــ بەرگی ٢ لا ٣٢١)[140].

بەڵام چۆن ئەکرێت ئەم بیرۆکەیە لەو یەکسانییەی نێوان ژن و پیاودا ڕەنگ بداتەوە کە ئەفلاتون باسی کردووە؟ ئایا نەیگوتووە هەردووکیان یەك سروشتیان هەیە؟ ئایا ئێمە لەبەردەم فەیلەسوفێکدا نین کە سەنگی ژن بەرز دەکاتەوە و بە باڵایدا دەبات کاتێك لە هەموو ئەرکەکانی دەوڵەتدا هاوبەشی پیاو دەکات؟ ئێستا ڕاڤەی ئەم بۆچوونە دەکەین.

## دووەم: یەکسانی لە نێوان هەردوو ڕەگەزەکەدا:

ئەفلاتون لە کتێبی پێنجەمی "کۆمار"دا دەگەڕێتەوە بۆ تاوتوێکردنی ئەو بابەتەی لە کۆتایی کتێبی چوارەمدا بە سەرپێیی دەیخاتە ڕوو، مەبەستم "هاوبەشێتی لە ژنان و منداڵان"ـدا ــ ئەو لێرەدا بیرۆکەی خۆی لەبارەی یەکسانی نێوان هەردوو ڕەگەزەکە دەخاتە ڕوو، ئەو پێی وایە «پیاوان سەگی پاسن و پاسەوانی مێگەل دەکەن» و ژنانیش وەك دەڵەك (مێیەی سەگ)ـی پاسن، ئەوانیش ئەبێت وەك پیاوان خەریکی شەوبێداری بن بۆ پاسەوانیکردنی مێگەڵەکە. مانای ئەمەش ئەوەیە دەبێت هەردوو ڕەگەزەکە پێکەوە خەرکی پاسەوانی بن. پاسەوانەکان ئامرازی بزوێنەری خودی دەوڵەتن، ئەوان "ڕوحی دەوڵەتن" هەر ئەوان بەرگریی لێ دەکەن، هەر ئەوانیشن کاروبارەکانی هەڵدەسوڕێنن، لە شاری ئەفلاتونیدا دەسەڵاتەکان لێك جیا نەکراونەتەوە، ئەمەش لە دەوڵەتانی کۆندا شتێکی ئاسایی بوو، ئەوانەی لە وەختی ئاشتیدا فەرمانڕەوایەتییان دەکرد و دەسەڵاتیان بەدەستەوە بوو هەر ئەمانە لە کاتی جەنگ و شەڕو شۆڕیشدا بەرگرییان لە دەوڵەت دەکرد. لێرەدا ئەفلاتون خۆی سەرقاڵ کرد بە هەڵبژاردن و فێرکردنی ئەم چینەوە. ئەم هەڵبژاردنە وردە غافڵگیرمان دەکات لە جیاکردنەوەی هەردوو ڕەگەزەکە، وەك ئەلیکسەندەر کۆرییە دەڵێت ئەگەرچی ژن بەشێوەیەکی گشتی لە پیاو بێ هێزترە، کەچی ئەم جیاوازییە جیاوازییەك نییە لە ماهییەتدا[١٤١]. بەڵام ئەگەر هەمان ئەرکی پیاومان بەسەر ژناندا سەپاند ئەوا دەبێت بە هەمان شێوەی پیاو فێریان بکەین (٤٥١هـ بەرگی ٢ لا ٣٠٤). کەواتە پێویستە ژنان بەشیان لە فێرکردن و هونەری جەنگدا هەبێت و لەڕووی پەروەردەی جەستەیی و میوزیك و وەستان بە ڕووتی بێ جارزبوونیش هەمان مامەڵەی پیاوانیشیان لەگەڵ بکرێت و ڕەنگە ئەم پێشنیارانە بەهۆی ناکۆکبوونیان لەگەڵ حاڵەتی باودا نامۆ و سەیر دەر بکەون (٤٥٢أ ــ لا ٣٠٥). بەتایبەتیش مەشقکردنی ژن بە ڕووت و قووتی لەگەڵ پیاواندا لە گۆڕەپانی وەرزشدا، مەبەستم تەنیا لە بچووکەکانیان (کەم تەمەنەکان) نییە، بەڵکو مەبەستم لە گەورەکانیشە. نابێت لە گاڵتە و تانەوتەشەری خەڵکانی قۆشمە و قەشمەرجارەکان بترسین

نه له پەروەردەی جەستەیی ژنان و نه له پەروەردەی میوزیکی و زەینییان و ڕاهێنانیان لەسەر هەڵگرتنی چەك و ئەسپ سواری (٤٥٢ ــ لا٣٠). ئەفلاتون پێی وایە گاڵتە و تانەی قەشمەرجاڕان دواکەوتوویيە و «گریك دەرك بەوە دەکات ئەمە بۆیان باشترە» (٤٥٢ أ) بەڵام دەبێت یەکەمجار لەوە بکۆڵینەوە ئایا «سروشتی ژن ڕێ دەدات بە بەشداریکردن لەگەڵ پیاوان له کارەکانیاندا، یاخود ناتوانێت هیچ کارێك لەو کارانە جێ بەجێ بکات» (٤٥٣أ). ڕاستییەکەی جیاوازی لەنێوان سروشتی پیاو و سروشتی ژندا تەنیا جیاوازییەکی زمانییە، خۆ ئەگەر پێویست بێت سروشتە جیاوازەکان ئەرکی جیاوازیش جێ بەجێ بکەن، ئەوا لێرەدا لەبەردەم سروشتێکی ژنانەدا نین که له سروشتی پیاو جیاواز بێت (٤٥٤أ). ئەگەر، وەك پێشتر لیکۆرگۆس گوتوویەتی، ژن له سەرجەم هەست و سۆزە ناسك و لاوازەکان، و خەسڵەتە گشتییەکانی مێینەیی وەك هەست بە شەرم کردن له ڕووتبوونەوە لەبەردەم پیاودا یان هەست کردن بە خۆشەویستی بەرامبەر پیاوێکی دیاریکراو، یان هەستی دایکایەتی بەرامبەر منداڵەکانمان.. هتد دابماڵین، ئەوا لەنێوان ئەو و پیاودا هیچ جیاوازییەك نامێنێتەوە جگە لەوەی که ژن منداڵی دەبێت و پیاویش منداڵ دەخاتەوە. بەڵام ئەمە جیاوازییەکی وا نییە له "سروشتی ژن" که له سروشتی پیاو جیای بکاتەوە و ئەوانەیش وەزیفەی تایبەتی ژن و پیاو نین, بەڵکو دەبێت بەدوای وەزیفەی تریاندا بگەڕێین. خۆ ئەگەر بەڵگەنەویست بێت پیاو دەوڵەت بەڕێوەدەبات و بەرگری لێ دەکات، ئەوا کێشەکەمان گەڕانە بەدوای وەزیفەیەکی هاوشێوەدا بۆ ژن. ئەفلاتون بەو دەرەنجامە دەگات له ژیانی شاردا وەزیفەیەك و کارێك نییە ئەنجامدانی بۆ سروشتی پیاو شیاو بێت و بۆ سروشتی ژن شیاو نەبێت. (٤٥٥أ) خۆ ئەگەر فەرق و جیاوازییەکان لەنێوان پیاو و ژندا بەرتەسك بکرێتەوە، ئەوا جیاوازی لەنێوانیاندا تا ڕادەی جیاوازی نێوان پیاو و پیاو، بۆ نموونه «لەنێوان پیاوی و کەچەڵ و پیاوی قژن»ـدا کاڵ دەبێتەوە(٤٥٤ بەرگی ٢ لا ٣٠٨). له هەموو ئەوانەیشەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە له بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا کارێك نییە تەنیا تایبەت بێت بە ژنان وەك

ئەوەی ژنن یان تەنیا تایبەت بێت بە پیاوان وەك ئەوەی پیاون، ئەگەرچی لە هەموو شتێکدا ژن کەم هێزترن لە پیاوان (٤٤٥عـ ـــ لا ٣٠٩).

ئەمەی باسکرا کورتەی هێڵە دیارەکانی بیرۆکەی بەناوبانگی یەکسانی هەردوو ڕەگەزەکە بوون کە ئەفلاتون لە کتێبی پێنجەمی کۆماردا دەیخاتە ڕوو، ئەم بیرۆکەیەش مشتومڕێکی زۆری لەنێوان لێکۆڵەراندا نایەوە لەو بارەی ئایا بەڕاستی ئەفلاتون ئازادیی ژنانی ویستووە؟ ئایا بە ڕاستی بانگەشەی یەکسانی لەنێوان هەردوو ڕەگەزەکەدا کردووە؟ ئایا ئەو لە جیهانی کۆندا پەیامبەری مافی ژنان بووە؟ ئایا لەپشت ئەو یەکسانییەی لەبارەیەوە دوواوە ئەنگێزەیەکی مرۆیی وا هەبووە شعوری جوڵاندبێ لەبارەی پەراوێزکەوتنی ژنان و ئەنجامدانی کاری سانای وەك ڕستن و چنین، ئەگەرچی لە کاتی ئاشتیدا توانای ئافراندن و داهێنان و لەکاتی شەڕیشدا توانای هێرشبردن و هەڵهاتنی هەیە؟ ئایا ئەو بانگەشەی کردووە بۆ سەرفرازیی ژنان لە زیندانەکانیان و ڕزگارکردنی (گەروی لەکارکەوتوو)-ی نیوەی کۆمەڵگەی کە پیاوان بە زۆری زۆردارەکی لە حەرەمسەراکاندا زیندانییان کردوون؟

هەندێك لە توێژەران بە قسەکانی ئەفلاتون تێکەوتوون و تەنیا حەرفییانە و ڕووکەشانە وەریان گرتووە، هەندێکیان وای بۆچوون «ئارەزووی ئەو لە یەکسانی نێوان هەردوو ڕەگەزەکە نارەزاییەك بووە دژی ئەو بوارە بەرتەسکە داخراوانەی کە تێیدا ژنی هاوسەردەمی خۆی لە کۆمەڵگەی ئەسینابیدا تێیدا قەتیس بوو بوو و بەوەش ئەو پێش بزوتنەوەی ئازادیی ژنان کەوتووە»[١٤٢]. من نازانم بە چ هەقێك ئەڵێن ئەفلاتون ئازادبوونی ژنانی وەك نیوەی کۆمەڵگە ویستووە، لە کاتێکدا بە تەواوی بێدەنگی کردووە لە باسی ژن لە ڕێسا میلییە ناسراو و باوەکەدا و هەرگیز لە بارەیەوە قسەی نەکردووە، ئەگەرچی لەمەیاندا ژن هەر بە ڕاستی نیوەی زیاتری کۆمەڵگەی پێك هێناوە. تەنانەت ئەگەر ئێمە بە ڕێگەی دیالۆگ بڕوامان بەوە هێنا ئەفلاتون بانگەشەی "ئازادبوونی ژنان"ی کردووە ئەوا ئەمە تەنیا بۆ چینی پاسەوانەکان ڕاستە، ئەم چینەش لەڕووی ژمارەوە زۆر کەم بوون و دەستەبژێریی ئەرستۆکراتی کۆمەڵگە بوون و «بە هیچ

کلۆجێك ناكرێت نیوەی کۆمەڵگە بن». بەڵکو ئەفلاتون کاتێك لە دیالۆگی "یاساکان"دا —وەك پاش کەمێکی تر دەبینین ـــ لە بارەی نیوەی کۆمەڵگەوە دوواوە قسەی لەسەر "ئازادبوونی ژن" نەکردووە، بەڵکو لەبارەی بەشداریکردنی لە خوانی خواردن، یان تەنیا لەبارەی ژەمی هاوبەشەوە قسەی کردووە، ئەوەش کاتێك پیاوێکی ئەسینایی گازاندەی ئەوە لە سپارتەییەکان دەکات «خوانە هاوبەشەکانیان کردۆتە خوانی پیاوان بێ ژنان، ئەگەرچی ڕێکخنەخستنی ژنانیش ﴾لەم خوانە هاوبەشانەدا﴿ تەنیا نیوەی کێشەکە نانوێنێت بەڵکو دوو هێندەیشی دەکات، چونکە ئامادەگییە خۆڕسکەکەی بۆ فەزیلەت زۆر کەمترە لە ئامادەگی پیاو» (٨٧١أ ـــ بەرگی ٤ لا ٣٦٩).

پاش کەمێکی تر دەگەڕێینەوە بۆ دیالۆگی یاساکان.

ڕەنگە ئەمە بووبێت "دیمۆنیلی"ی ڕاکێشا بێت بۆ گومانکردن لە تەواوی ڕێڕەوی پاساوەکە بۆیە دەڵێت «مرۆڤ دەچێتەوە سەر ئەم بابەتە و گومان لەو ڕۆڵە تەواو هاوشێوەیە دەکات کە ئەفلاتون بۆ هەردوو ڕەگەزەکە خوازیاری بووە، فەرامۆشکردنی جیاوازییە فیسیۆلۆژییەکان وەك ئەوەی جیاوازیگەلێکی بێ بایەخن و پشتگوێخستنی ئەو جیاوازییە سایکۆلۆژییانەی کە هەیانە وامان لێ دەکەن بگەینە لێواری ئەو مەترسییەی لێیەوە هەڵدەخلیسکێین بۆ فەرامۆشکردنی جیاوازییە تایبەتمەندەکانی ژن»..[١٤٣].

ئەمە لە کاتێکدا دزەکردنی پاساوەکان تا ئەوپەڕی سادەن و زۆر بە کورتی لە ڕقی میتافیزیکییانەی ئەفلاتون لە مادە و بەشێوەیەکی گشتی لە جەستە دەست پێ دەکەن و ئەم ڕقەش وای لێ کردووە لە بنیاتنانی دەوڵەتە فازلەکەی خۆیدا ڕوو لە دروستکردنی چینێك لە فەرمانڕەوایان و یاریدەدەرەکانیان (واتە پاسەوانەکان) بکات کە نزیکتر بن لە "فەیلەسوفی زاهید"ەوە و بە پێی توانا هەوڵ بدەن بۆ ڕزگاربوون لە جەستە و داواکارییەکانی جەستە، هەروەها کاروبارەکانی ئەم جیهانە مادییە سەرکوت بکەن و خۆیان تەرخان بکەن بۆ خزمەتکردنی فەلسەفە و وەدیهێنانی عەدالەت.

بەڵام ئەمە سەرناگرێت تا پاڵنەرەکانی خۆپەرستی لێ دانەماڵێن و دووبەرەکی تۆوبڕ نەکەین، ئەوەش بە قەدەغەکردنی موڵکایەتی تایبەتی. بەڵام دەستبەجێ ئەمە دەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەی خێزان: «لەنێوبردنی موڵکایەتی تایبەتی مانای ئەوەیە ئیدی پیاو پێویستی بەوە نییە میراتگیرێکی شەرعی هەبێت کە خاوەنی ڕەچەڵەکێکی دیار بێت، بەم جۆرە شاری فازیلە دەتوانێت مۆنۆپۆلکردنی سێکسییانەی ژن لەنێو بەرێت کە لای خۆیەوە سەرچاوەی دووبەرەکی و ئاژاوە بووە لەنێوان پیاواندا»[١٤٤].

ئەگەر خێزان لە ئارادا نەبێت ئەو ڕۆڵە تەقلیدییەیش بزردەبێ کە ژن ئەنجامی داوە. بەڵام لە شارە فازلەکەی ئێمەدا هەر تاکێك وەزیفەیەکی گونجاوی تایبەت بی خۆی هەیە، کەواتە دەبێت بۆ ژن بەدوای وەزیفەیەکی تری جگە لە وەزیفە تەقلیدییەکەی خۆی بگەڕێین، لەم حاڵەتەشدا هیچ ڕێیەکمان لە پێش نییە جگە لەوەی بیگۆڕین بۆ پیاو تا ئەویش هەمان ئەرکی بکەوێتە ئەستۆ!. بەڵام ئەمە پێویستی بە کەمێك ڕوونکردنەوە هەیە: وەك پێشتریش باسمان کرد، دەبێت لەم بوارەوە پەروەردەی هاونیشتمانی بکرێت، پەوەردەش واتە ئامادەکردنی بۆ ئەنجامدانی یەك وەزیفەی وا کە بۆ توانا و لێهاتووییەکانی ئەو شیاوە. ئێمە ئێستا پەروەردەی "پاسەوانەکان" ئەکەین، باوکێك لە گۆڕێدا نییە ئەم کارە بکات، بەڵکو دەبێت دەوڵەت بەرپرسارێتی باوك هەڵبگرێت چونکە ئیدی خێزان بوونی نییە. وەك کەمێك پێشتر وتمان، خۆ ئەگەر نەریت وا بووبێت پیاو بۆ سیاسەت و جەنگ ئامادە بکرێت، ئەی ئەو وەزیفەیە چییە کە دەبێت دوای هەڵوەشانەوەی خێزان ژن هەیبێت؟ ناکرێت بوترێت ئەم وەزیفەیە وەچەخستنەوەیە چونکە ئەگەر وابێت ئەوا ڕۆڵی پیاو، کە لەم پرۆسەیەدا هاوبەشە، کەم کراوەتەوە. ئەمە وێڕای ئەوەی ماوەکانی منداڵبونی کورت و «دیاریکراوە، بە جۆرێك کە دەوڵەت بە وردییەوە دیاریی دەکات بە پێی پلانێکی دانیشتوان بۆ ئەوەی ژمارەی دانیشتوان کەم و زیاد نەکات چونکە دەبێت بە پێی توانا ژمارەی دانیشتوان وەك خۆی و بە جێگیریی بمێنێتەوە». (٥٦٠أ ــ بەرگی ٢ ــ لا٣١٥)[١٤٥]. هەر منداڵێکیش لە دەرەوەی ئەم "ڕێکخستنە توندوتۆڵە" لە دایك ببێت، ئەوا بە منداڵێکی "بێ کەس" و

دۆزراوە دادەنرێت (٤٦١ب ــ ص٣١٧). ئینجا دوای ئەوە دەوڵەت خۆی سەرپەرشتی منداڵەکان دەکات، بە جۆرێك کە دەیانخاتە ژێر سەرپەرشتی دەستەیەکەوە کە پێکهاتووە لە پیاوان یان ژنان یان لەبەرئەوەی ئەرکە گشتییەکان هاوبەشە لەنێوان پیاو و ژندا، لە هەردوو ڕەگەزەکە پێکهاتووە تا کاروباری منداڵەکان بەڕێوەببەن (٤٦٠ب ــ ص٣١٥).

بەم جۆرە دەبینین ناتوانین بڵێین ئەو وەزیفەیەی کە بۆ ژن بەدوایدا دەگەڕێین بریتییە لە وەچەخستنەوە چونکە ئەمە لەنێوان ئەو و پیاودا هاوبەشە، ئەمەش بریتی نییە لە "سەرپەرشتیکردنی پەروەردەی منداڵ" چونکە ئەمەیان تایبەتمەندی پیاویشە. هەروەها ناتوانین بڵێین وەزیفەی ژن دایکایەتییە، چونکە ڕاستییەکەی "دایکایەتی" بە مانای وردی وشەکە لە ئارادا نییە، ئەفلاتون بە ڕوون و ڕەوانی دەڵێت «کاتێك مەمکی دایکەکان پڕ دەبێت لە شیر دەبێت بگوازرێنەوە بۆ خانەی دایەنگا، لەگەڵ گرتنەبەری هەموو ئەو ڕێگایانەی کە دەستەبەری ئەوە دەکەن دایکان ڕۆڵەکانی خۆیان نەناسنەوە».. (٤٦٠أ ــ بەرگی ٢ ــ ل٣١٦). خۆ ئەگەر دایکان نەتوانن شیر بدەن، ئەوا دەبێت شیردەرانی دیکە ببینرێنەوە و دەبێت ئەو کاتانەیش دیاری بکرێن کە دایکان شیر بە منداڵەکان بدەن بێ ئەوەی شەو بێداریی تێدا بێت «چونکە ئەمە و کارەکانی تریش کاری پەرستار و خزمەتکارەکانن» (٤٦٠حـ ــ ل٣١٦). دوای هەموو ئەمانە، ژن ناتوانێت خۆی بۆ دایکایەتی تەرخان بکات. ئەوەش «لەبەرئەوەی ڕێوشوێنێکی وامان هەیە لای ژنانی پاسەوان دایکایەتی دەکاتە کارێکی کەم بایەخ» (٤٦٠ب ــ ل٣١٦). کەواتە دایکایەتی وەزیفەیەکی سەربەخۆ نییە تا ژنان ئەنجامی بدەن چونکە پێویستی بی خۆتەرخانکردنی تەواو نییە. ئیجا ناشکرێت بەو ڕۆڵە تەقلیدییەی کە پەیوەست بوو بە خێزان و موڵکایەتییەوە پێناسەی ژن بکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت هەر تاکەکەسێك لە دەوڵەتە ئایدیالییەکەماندا وەزیفەیەکی وای هەبێت کە بەهۆیەوە بناسرێتەوە: ئەمەیان دارتاش، ئەمەیان دروستکەری پێڵاو، ئەوەشیان پزیشك..هتد. ئەی چی لەبارەی ژنەوە بڵێین کە وەزیفەی نەماوە؟ ئایا لە هەڵوێستێکدا

نین کە ببێتە مایەی داڕوخانی پەروەردە؟ پاشانیش هەڵتەکانی دەوڵەت لە بناغەکەیەوە؟ ئەی پەروەردە دەتوانێت چی بکات ئەگەر نەتوانێت کتومت ژن بۆ وەزیفەیەك ئامادە بکات؟ ئەمە لەکاتێکدا لەنێوان ئێمەی مرۆڤدا فەرق و جیاوازی شاراوەی ئەوتۆ هەیە وا لە هەر یەکێکمان دەکەن بۆ کارێکی تایبەتی شیاو بێت (٣٧٠ بەری ٢ ــ لا ٢١٢). ئەی ئەو کارە چییە کە لە کارەکانی تر بۆ ژن شیاوترە؟ دەبێت ئەوەشمان لە زەیندا بێت ئەو وەزیفەیەی تایبەتە بە کەسێك هەموو ژیانی کەسەکەیش پێك دەهێنێت، لەسەر ئەم بنەمایە ئەو دارتاشەی کە دکتۆر سیستەمێکی تەندروستی ماوەدرێژی بەسەردا سەپاندووە بە دڵنیاییەوە کاتێکی وەهای بۆ ناهێڵێتەوە تا تیایدا نەخۆش بکەوێت، چوون ناکرێت وەزیفەی ئەو لەم دنیایەدا نەخۆشکەوتن بێت. ژیانێك بێ سوودە کە تێیدا تاکەکەس خۆی بۆ نا-نەخۆشی تەرخان نەکات، و لە ڕێگەیەوە ئەو کارەی کە دەبێت ئەنجامی بدات، فەرامۆش نەکات» (٤٠٦هـ بەرگی ٢ ــ ص٢٥٥). بەم جۆرەش ناچێتەوە لای پزیشکەکە و دەگەڕێتەوە سەر ژیانە ئاساییەکەی خۆی و تەندروستی باش دەبێتەوە و دەست دەکاتەوە بە ژیان لەگەڵ کارەکەی و بەهرەکەیدا، یاخود مەرگ لە هەموو دەردەسەرییەك ڕزگاری ئەکات(٤٠٦ عـ)، وەزیفەکەی ژیانییەتی ئەگەر لەکار کەوت ئەوا مردن باشترە لە پاڵدانەوە بە بێ کار.

دیسانیش گەڕاینەوە سەر هەمان پرسیار: ئەو کارە چییە کە هی ژنە و بارتەقای ژیانییەتی؟ هەموو پەیوەندییە خێزانییەکانمان لێك پچڕاند، ئێستا ئیدی ژن لە چینی پاسەوانەکاندا نە لە پەیوەندییەکی بەشەکییانەدایە بە پیاوێکی دیاریکراوەوە و نە منداڵی هەیە و نە ماڵ «هیچ یەکێکیان بۆیان نییە لە گەڵ پیاوێکدا لەژێر یەك باندا نیشتەجێ بن، دەبا منداڵەکانیش منداڵی هاوبەش بن بە جۆرێك کە نە باوك منداڵی خۆی بناسێتەوە و نە منداڵ باوکی خۆی».. (٤٥٧ب ــ بەرگی ٢ ــ لا٣١٢). وەك پێشتریش باسمان کرد ئەمە ئەو بەرەنجامەیە کە لە هەڵوەشاندنەوەی موڵکایەتی تایبەتەوە دەکەوێتەوە کە هۆکاری دووبەرەکی و ڕق و کینەیە.

ئێستا دوای ئەوەی هەموو وەزیفە تەقلیدییەکانی خێزانمان لەنێو برد گەیشتووینەتە کوێرە ڕێگا، پاشانیش هیچ لەبەردەم ئەفلاتوندا بۆ هەڵهاتن نەماوەتەوە جگە لەوەی ژن بگۆڕێت بۆ پیاو، بە جۆرێك ڕێی ئەوەی بۆ ژن ئاسان کردووە سەرجەم ئەو وەزیفانەی هەبێت کە پیاو لە بوارەکانی سیاسەت و بەڕێوەبردنی دەوڵەت و فەرمانڕەوایی و پەروەردەدا و..هتد پێیانەوە سەرقاڵە. ئەفلاتون هیچی بۆ نەماوەتەوە جگە لەوەی وەك پیاو تەماشای ژن بکات، یاخود فەرقێکی لەگەڵ پیاودا نەبێت مەگەر وەك فەرق لەنێوان پیاوی کەچەڵ و پیاوی قژن دا! ئیرنست بارکەر دەڵێت: «ئیدی لەڕووی جۆرەوە جیاوازییەك نەماوە لەنێوان پیاو و ژندا، تەنیا وەزیفەی سێکسی لەنێوانیاندا جیاوازە، بەڵام لە هەموو وەزیفەکانی تری ژیاندا ژن لە پیاوێکی بێ هێز زیاتر هیچی دیکە نییە، هەمان توانای پیاوی هەیە بەڵام هەمان هێز نا»..[١٤٦].

بەم جۆرە سووك و ئاسان ئەفلاتون توانی دان بەوەدا بنێت سروشتی ژن بە جۆرێکی وا لە سروشتی پیاو جیاواز نییە کە کار بکاتە سەر بەشدارییەکانیان لە ژیانی سیاسیدا (٤٥٥أ ــ بەرگی ٢ ــ ل٣٠٩). بەڵێ لە چینی پاسەوانەکاندا ژن جیاواز نییە لە پیاو، چونکە ئەفلاتون لە هەموو خەسڵەتەکانی ژنی داڕنیوە و لەسەر "جوامێریی" یان "پیاوەتی" کە دەوڵەت پێویستی پێیەتی ڕای هێناوە.

لیۆ شتراوس دەبێژێت: «سوکرات لە هێنانەوەی بەڵگەدا لەسەر یەکسانی نێوان هەردوو ڕەگەزەکە، جیاوازیگەلێی پەیوەست بە پرۆسەی وەچەخستنەوەی خستەڕوو. ئەمەش لە هەمان کاتدا مانای دوورخستنەوەی جیاوازییە جەهەرییە جەستەییەکانە لە ڕەگەزی مرۆیی، واتە دوورخستنەوەی جەستە تا ئەو پەڕی ڕادە بەجۆرێك کە چارەسەری جیاوازیی نێوان پیاو و ژن دەکات کە دەکرێت بە جیاوازی نێوان پیاوی کەچەڵ و پیاوی قژدار بەراورد بکرێت»[١٤٧]. خۆ ئەگەر سیمۆن دی بۆڤوار وای ببینێت جەستەی ژن ڕەگەزێکی سەرەکییە لە پێکهێنان و دیاریکردنی ڕەوشەکەی لە جیهاندا[١٤٨]، ئەوا ئەفلاتون بڕیاری ئەوەی داوە ئەم ڕەگەزە (واتە جەستە) بە تەواوی بسڕێتەوە تا ئەوەی تەنیا دەبێتە "ئامرازی پێ هەڵهێنان" واتە تەنیا ئامرازی وەچەخستنەوە، بەم جۆرە

سەرجەمی ئەو خەسڵەتانەی کە ئەفلاتون ویستوویەتی ژن دوای "ڕزگاربوونی" لە خەسڵەتی ژنانە هەیبێت بریتییە لە خەسڵەتە "پیاوانە"کان، وەك توانای شەڕکردن، ڕووبەڕووبوونەوە لە جەنگدا و ئەنجامدانی ڕاهێنانەکان بە ڕووتی لە بەردەم پیاواندا، ئەو دەیەوێت بوونی ژن وەك ژن هەڵوەشێنێتەوە و ببینێت ئەویش تێکەڵ بە پیاوان دەبێت وەك ئەوەی یەکێك بێت لەوان، بێ لەبەرچاوگرتنی جیاوازی لەنێوان هەردوو ڕەگەزەکەدا».. [149]. ڕقی ئەفلاتون لە جەستەی ژن نەبووە کە وای لێ کردبێت بیگۆڕێت بۆ ژن، وەك دواتر دەبینین ئەو ڕقی لە جەستە بووە وەك ئەوەی کە هەیە و هەر لە بنەڕەیشەوە متمانەی بە دیاردە هەستەکییەکان نییە چوونکە —لە باشترین حاڵەتدا— ئەوانە سێبەری حەقیقەتن. بەڵام هۆکارە ڕاستەقینەکەی ئەوەیە هەڵوەشاننەوەی موڵکایەتی تایبەتی کە بۆتە هۆی هەڵوەشانەوەی خێزانیش، ژنی خستۆتە هەڵوێستێکی نامۆوە کە ئەفلاتونی تووشی دوو دڵی کردووە بۆیە گۆڕیویەتی بۆ پیاو. "ڕۆسۆ" لە یەکەمین ئەو بیرمەندانە بووە کە سەرنجیان لەم حەقیقەتە داوە ئەوەش لەمیانەی هێرشە توندەکەیدا بۆ سەر ئەفلاتون بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی خێزانەوە: «من دەزانم ئەفلاتون لە کۆمارەکەیدا یەك مەشقی وەرزشی بۆ پیاوان و ژنان داناوە.. ئەوەش لەبەرئەوەی کە خێزانی لە حکومەتدا هەڵوەشاندەوە، ئیدی نەیزانی چی لە ژنان بکات! جا بۆیە دواتر ناچار بوو بیانکات بە پیاو».. [150].

## کۆتایی

لەمەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی ئەفلاتون لە کۆماردا بانگخوازی ئازادیی ژن و یەکسانبوونی نەبووە لەگەڵ پیاواندا، بەڵکو بەپێچەوانەوە لە کتێبی سێیەمدا ڕقی خۆی لە ژن دەردەبڕێت و ئەو هۆشدارییەمان پێ دەدات کە گەنجەکان لاسایییان نەکەنەوە، پاشانیش دوای هەڵوەشاندنەوەی موڵکایەتی لە چینی پاسەوانەکاندا کۆمەڵە ژنەکەی خۆی هەڵدەبژێرێت «دەستەبژێرێك تا بیانکاتە پیاوانێکی پاسەوان» دوای پاککردنەوەیان لە سەرجەم خەسڵەتەکانی مێیینە چونکە هیچ وەزیفەیەکیان بۆ نەماوەتەوە.. دوای هەڵوەشاندنەوەی ڕۆڵی تەقلیدییانەی ژن لە خێزاندا، ئیدی دەبوو ژن لە وەزیفەکاندا هاوبەشی پیاو بکات، ئەگەر نا بە بێ وەزیفە دەمایەوە و ئەو پەروەردەیەش شکستی دەهێنا کە ئامادەکردنی هاونیشتمانی بوو بۆ وەزیفەی گونجاوی خۆی. هەڵوەشاندنەوەی خێزان لە دەرەنجامی هەندێك چاکسازییەوە بوو کە ئامانجی لەنێوبردنی ململانێی مەدەنی بوو، موڵکایەتیش (بە موڵکایەتی ژنیشەوە) لە پێشەوەی کارکردەکانی ئەم ململانێیە بوو[١٥١].

ڕقی ئەفلاتون لە سامان، ئینجا بە شێوەیەکی گشتی لە موڵکایەتیش، پێشەوەچوونێك بوو بەرەو بنەما میتافیزیکییەکەی کە بووە مایەی هەموو ئەم پەرەسەندنانە ئەمەش وامان لێ دەکات بتوانین بڵێین: «بیروبۆچوونەکانی ئەفلاتون لە بواری ئاکار و پەروەردە و سیاسەتدا بۆچوونە میتافیزیکییەکانی پشت ئەستوور دەکات وەك چۆن بۆچوونە میتافیزییکەکانیشی لای خۆیانەوە هزرەکانی ئەو لەم بوارانەدا پشت ئەستوور دەکەن».. [١٥٢].

مانای هەموو ئەمانە ئەوەیە ئەفلاتون "ئازادبوونی ژن"ی وەك نیوەی کۆمەڵگە ناوێت، خۆ ئەگەر خوازیاری ئەمە بووایە بە خەمساردی و بێ دەروەستی ژنی لەو ڕێسا زاڵ و باوەدا جێ نەدەهێشت کە ڕەوشی نالەباری کۆمەڵگە بەرهەمی هێنا بوو.

ڕەوشی ژن لەم چینەی خوارەوەدا بە تەواوی پەیوەست بوو بە بوونی موڵکایەتییەوە، کتومت وەك ئەو ئازادییەی کە ئەو خوازیارییی بوو پەیوەست بوو بە هەڵوەشاندنەوەی ئەم موڵکایەتییە و ئینجا هەڵوەشاندنەوەی خێزانەوە! ئەفلاتون لەبارەی ژنەوە وەك ئەوەی ژنە قسەی نەکردووە، بۆیە کاتێك لەبارەی دیالۆگی یاساکانەوە دەدووێین دەبینین چۆن ماف بۆ ژن بە ڕەوا نابینێت «جا ئەو چۆن دەتوانێت بیر لە مافی ژن بکاتەوە، لە کاتێکدا خۆی بیری لە کەمترین ڕادەی مافی پیاویش کردۆتەوە؟ ئەم پرسە بەرەنجامێکی لۆژیکی بنەما تایبەتییەکانی بوو، چونکە دەبوو هەر تاکەکەسێك ئەو کارە ئەنجام بدات کە بۆی گونجاو بوو»..[١٥٣].

کاتێکیش دوای هەڵوەشاندنەوەی ڕۆڵە تەقلیدییەکەی ژن لە خێزاندا، وەزیفەیەکی ئەوتۆی بۆ نەدەبینینەوە —چونکە گوایە وەزیفە سروشتییەکەی ئەوەیە کەیبانووی ماڵ بێت-، ئەوا پێی وابوو ژن توانای هەڵگرتنی قەڵغان و سواربوونی ئەسپ و چوونە نێو سلکی سەربازیی هەیە تا ببێتە جەنگاوەر یان یەدەگی جەنگاوەر «پیاو و ژن پێکەوە دەچن بۆ شەڕ، بگرە ئەو منداڵانەشیان لەگەڵ خۆیان دەبەن کە توانایان هەیە».. (٤٤٦) وەك ئەوەی زمانحاڵی ئەفلاتون ئەوە بێت کە بڵێت یان دەبیتە ژنی هەڵسوڕێنەری ماڵ یان دەبیتە پیاو!.

دەبێت سەرنجی ئەوەیش بدەین ڕقی ئەفلاتون لە ژن تەنانەت لە دیالۆگی کۆماریشدا دیار و بەرچاوە، چوون ئەو لەبارەی ژنەوە نادوێت وەك ئەوەی ژنن، تەنیا بە ڕسواکردنێکی زۆرەوە نەبێت و لەگەڵ ئاژەڵ و منداڵ و شێتەکاندا پۆلێنی دەکات. ئینجا ئەیخاتە نێو کەل و پەل و کەرەستەکانی پیاو و ئەو شتانەوە کە دەکرێت بکرێنە موڵك، ناشیەوێت پەیوەندی لەنێوان ژن و پیاودا لەسەر بنەمای هەست و سۆز و خۆشەویستی و هاوڕێیەتی بێت بەڵکو پەیوەندییەکی "نا کەسەکی" دەوێت، بگرە لە گاڵتەپێکردنی هەست و سۆزەکانی ژن و ڕووشاندنی کەرامەتیدا دەگاتە ئەوەی بڵێت جەنگاوەرێکی نەبەرد دەبێت بە ژنی زۆر و "مافی زیاتری وەچەخستنەوە" پاداشتی

ئازایەتییەکەی بکرێتەوە (٤٦٨) دەبێت ژنیش بە هەموو سنگفراوانی و ئارامییەکەوە ئەوە قەبوولْ بکات کە تەنیا ئامرازێکە بۆ پاداشتکردنی جەنگاوەرە نەبەردەکان[١٥٤].

خۆ ئەگەر ئەفلاتون لە کتێبی سێیەمدا هۆشداریی بە گەنجەکان دابێت لەبارەی لاساییکردنەوەی ژنانەوە ئەوا لە کتێبی هەشتەمدا —کە لەوێدا وێنە داڕووخاوەکانی ڕێکخستنی سیاسی دەخاتە ڕوو ــ بەو دەرەنجامە دەگات ژن و داڕزانی فەرمانڕەوایی پێکەوە دەبەستێتەوە، جا ئەم پرسیارە دەخاتە ڕوو:

چۆن وێنەی گەنجێك دروست دەبێت کە خولیای سیستەمی حکومەتێکی "تیمۆکراتی Timocracy" بێت؟ وەڵام دەداتەوە «یەکەمجار ئەم خولیایە لە ڕێگەی قسەکانی دایکییەوە دروست دەبێت، کاتێك سکاڵای ئەوە دەکات باوکی لەنێو خەڵکانی خاوەن پلە و پێگەدا هیچ پۆستێکی نەگرتووە، ئەمەش لەنێو ژنانی تریشدا دەبێتە مایەی گاڵتەجاڕیی، هەروەها دەشبینێت بە کەمی خەریکی باری کۆکردنەوەی ماڵ و سامانە و بێ توانایشە لە چوونە نێو جەنگە دەمگۆییەکان و بەڕوودا وەستانەوەی لاقرتی پێکردنی، جا ئەمە لەنێو کایەی گشتیدا بێت یان لە دادگاییەکاندا. ئینجا پێی وایە هەمیشە تەنیا بیر لە خۆی دەکاتەوە و مامەڵەیەکی نەشیاوی لەگەڵ دەکات.. هەموو ئەمانەش بێزاریی و وەڕزبوون لە دەروونیدا گەشە پێ دەدەن، بۆیە ئاگاداری ئەکاتەوە لەوەی باوکی بە مانایەکی دروست پیاو نییە و زیاد لە ڕادەش ڕسوایە، ئیدی زۆرێك لەم سیفەتانە کە ژنەکانی هاوشێوەی پێیان خۆشە لەم دۆخانەدا باسیان بکەن، دەکات بە نێو گوێیەکانیدا».. (٥٤٩). ئەفلاتون لەو وتەیەدا لە بیری ناچێت ئەوەمان بە یاد بهێنێتەوە کە ئەمە شێوازی مامەڵەکردنی خزمەتکارەکانە «خزمەتکار بە نهێنی هەر بەم جۆرە لەگەڵ منداڵەکاندا دەدوێن».. (٥٥٠).

بەم جۆرەش ئەفلاتون لە خێزانی ئاساییدا وا وێنای ژن دەکات —کاتێك ژنی مێردداره یان کەیبانووی ماڵە ــ کە هۆکاریی سەرەکی داڕزینی کۆمەڵگەیە، ژن بایەخ بە بەرژەوەندییە نەرگسییە تایبەتەکانی خۆی دەدات، بۆیە مێرد و منداڵەکانی

بەرەو دارزین پـاڵ پێـوە دەنێـت وەك ئـەوەی ئـەوان "پانـدۆرا Pandora" بـن کـە میتۆلۆژیا یۆنانییەکان وەك سەرچاوەی یەکەمی هەموو خراپەکان وێنایان کردووە.

دواتر بۆچوونی ئەفلاتون بەشێوەیەکی گشتی لەسەر ژن دەبینین، بەڵام ژنێکی بـە پیاوکراوی چینی پاسەوانەکان نا، بەڵکو سەرجەم ڕەگەزی مێیینە بە گشتی، ئـەویش لەگەڵ ئەوەی لێرەدا باسمان کرد زۆرێکی وەهای فەرق نییە. ئەمەوێت ئەم بەشـە بـەو بۆچوونە تەواو بکەم کە لە دیالۆگی کۆماردا باسی لێ کراوە: لەم دیالۆگەدا سوکرات لەبارەی ڕێگای مامەڵەکردن لەگەڵ تالآنی و دەستکەوتەکانی جەنگەوە پرسیار دەکات و دەڵێت: «ئایا دوای سەرکەوتن ڕازیت لەسەر ڕاوڕووتکردنـی مردووەکـان؟» ئینجـا یەکسەر خۆی وەڵامێکی وەهای ئەم پرسیارە دەداتەوە کە دەلالەتێکی تایبەتی هەیـە و دەبێژێت: «چاوچنۆکێکی خاوەن ڕەزیلەت مرۆڤ بە مردوویی تالآن دەکات، چـونکە مامەڵەکردن لەگەڵ لاشەدا وەك دوژمنێکی نەفس نزم تەنیا لایەق بە ژنانە».. (٤٦٩ هـ ــ ٣٢٨لا)

چـونکە لـە ڕوانگـەی ئەفلاتونـەوە دوژمنـە ڕاسـتەقینەکە ڕوحـی کەسـەکەیە ﴿مردووەکە﴾، جا کە ئێستا ڕوحەکـە دەرچـووە و هەڵوەشـاتەوە ئیـدی هیچـی جـێ نەهێشتووە جگە لە ئامرازی شەڕکردنەکەی، بۆیە ڕاوڕووتکردنی لاشەکان وەك کـاری ئەو سەگە وایە کە شالآو بۆ ئەو بەردە دەبات لێی دراوە بێ ئەوەی توخنی ئەو کەسـە بکەوێت کە تێی گرتووە (هەمان سەرچاوە). جارێکی دیکەیش ڕەفتاری ژن —کـە بـە سووك و بێ بایەخ وەسفی دەکات ــ بە توندی پەیوەست ئەکرێتەوە بە ئاژەڵەوە..!

# بەشی دووەم

# ژن لە دیالۆگی یاساکاندا

## یەکەم: گەڕانەوەی موڵکایەتی

هەرگیز ئەفلاتون ئیمانە قووڵەکەی بە نموونەی باڵای ئەو ژیانە کۆمەڵایەتی و سیاسییە لەق نەبووە کە لە "کۆمار"دا خستوویەتییە ڕوو، ئەم "نموونەیە" بە تەواوی دەوڵەتی فازیلەیە، بەڵام دوای ساڵانێك بۆ ئەم ئایدیاڵە تێکۆشا و شەڕی ژیانی بۆ کرد و پاش ئەوەی سێ جار چوو بۆ سەراقۆستە و دووچاری داڕووخانێکی قورس بوویەوە، بێ ئومێد بوو لە توانای وەدەیهێنانی ئەم نموونە باڵایە لەسەر ئەم زەمینە، ئەوەتا لە دیالۆگی "یاساکان"دا کە لە پیرێتیدا نوسیوویەتی دیسانەوە گوزارشت لەم ئیمانە قووڵەی دەکاتەوە و بە داخ و پەژارەوە دەڵێت «باڵاترین وێنەی دەوڵەت و حکومەت و یاسا ئەو نموونە کۆنە فەراهەمی دەکات کە دەڵێت «هەموو شتێك لەنێوان هاوڕێکاندا هاوبەشە» جا چ شیاو بێت ئەمە لەسەر زەمین وەدی بێت، یان چ شیاو بێت ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو جڤاتە بێتە بوون کە سیستەمی هاوبەشێتی ژن و منداڵ و موڵك و بگرە هەموو جۆرە موڵکەکان، تێیدا زاڵ دەبێت و لەمەشەوە بە تەواوی بیرۆکەی موڵکایەتی تایبەتی و ئەو زمانەی گوزارشتی لێ دەکات لە ژیاندا بزر دەبن، لەوێدا تەنیا یەك دەوڵەت هەیە و لە یەك جەستە و یەك عەقڵ پێك دێت، خۆشی لە یەك چێژ دەبینێت و هەست بە یەك ئازار دەکات. من ئەڵێم جا ئایا ئەم نموونە باڵایە لە ئێستا بێتە دی یان لە ئاییندە یاخود شتێکی لەم جۆرە هەر مەحاڵ بێت، بەڵام شتێکی حاشا هەڵنەگر هەیە، ئەویش ئەوەیە ئەم نموونە باڵایە بەرژەوەندی گشتی

زیاتر له هەربەرژەوەندییەکی دیکە وەدی دێنێت» (٧٣٩ هـ ـــ بەرگی ٤ ـــ لا٣٠٨).

ئەفلاتون ئەگەڕێتەوە بۆ ڕاڤەکردنی ئەو هۆکارانەی کە وا دەکەن وەدیهاتنی شارە فازیلەکەی کۆمارەکەی دەکەنە کارێکی مەحاڵ و دەڵێت: «ئەم نموونە باڵایە تەنیا شیاوی خوداکان یان نەوەی خواکانە»، بەم جۆرە ئەفلاتون ئەگەڕێتەوە و موڵکایەتی تایبەتی ڕەوا دەکاتەوە «لێیان گەڕێ با زەوی و ماڵەکان لەنێوان خۆیاندا بەش بکەن و داچاندنی زەوی با هاوبەش نەبێت چونکە شتێکی وەك ئەمە بۆ کەسانێك نابن کە لەژێر سایەی ئەم سیستەمەی ئێستادا لەدایك بووبن و بەشێوەی باو ڕاهێنرابن و فێر کرابن» (٧٤٠ ـــ بەرگی ٤ ـــ لا٣٠٨).

بەم جۆرە ئەفلاتون لە دەوڵەتی یاساکاندا—دووەم دەوڵەتی فازیل ـــ یەکەم بڕیاری مەترسیداری خۆی دەدات کە وای دەبینێت وەدیهێنانی شیاوە، چونکە لە واقیعەوە نزیکترە «درەنگ وەختێك لە دیالۆگی یاساکاندا ئەفلاتون وەسفی کۆمەڵگایەك دەکات کەمتر یۆتۆپییە لەوەی لە دیالۆگی کۆماردا باسی دەکردوە، ئەم کۆمەڵگە نوێیەش لە بەرەنجامی یەکخستنی ڕێبازە ئایدیالێیەکەی لە لایەك (وەك ئەوەی لە کۆماردا خستبوویە ڕوو) و ژیانی واقیعییانەی ئەسینایی لە لایەکی ترەوە، پەیدا بوو»[١٥٥].

بەم جۆرە ئەفلاتون بە وردییەوە پێگەی دەڵەتە نوێیەکەی دیاری دەکات و پێشنیار دەکات لە دەریا دوور بێت تا خەڵکەکەی نەچنە ژێر باری هەناردەکردن و هاوردەکردنەوە..هتد. ئەو بە ڕوونی ئەوە دەزانێت کە تێڕوانین لە موڵکایەتی بنچینەی هەموو یاساداڕشتنێکە، ئەوەش نهێنی ئارامی و ئاساییشی دەوڵەتە (٧٣٦ د) ئەو لێرەدا کۆك و هاوڕایە لەگەڵ ئەوەدا کە پێشتر لە دیالۆگی کۆماردا باسی ئەوەی کردبوو کە بارگرژیی سیاسی سەرچاوەکەی تەنیا کارکردە ئابوورییەکانە. ئەفلاتون یەکێك بوە لەو فەیلەسوفانەی بڕوایان بەوە بووە موڵکایەتی سەرچاوەی یەکەمی کێشمەکێشم و دووبەرەکییە[١٥٦].

ئەفلاتون ئەپرسێت ڕێگای ئایدیاڵی بۆ دابەشکردنی زەوی کامەیە؟ وەڵام دەداتەوە کە دەبێت یەکەمجار ژمارەی هاونیشتمانیان لە دەوڵەتەکەدا دیاری بکەین، ئینجا بە یەکسانی زەوی و شوێنی نیشتەجێبوونیان بەسەردا دابەش دەکەین، بە بۆچوونی ئەو ژمارەی گونجاویش ئەوەیە «پەنجا یان چل هەزار خاوەن زەویمان هەبێت کە بتوانن پارێزگارییان لێ بکەن، ئینجا زەوی و ماڵەکانیان بە یەکسانی بەسەردا دابەش دەکەین، بە جۆرێك کە هەر سەرۆك خێزانێك بەشێکی بەر بکەوێت» (٧٣٧د — بەرگی ٤ ــ ٧٤٠٦٣)، دەبێت ژمارەکەیش بە جێگیریی بمێنێتەوە، خۆ ئەگەر ژمارەی دانیشتووان زۆر بوون، ئەوا لەم حاڵەتدا دەبێت ڕێژەی منداڵبوون دیاری بکرێت، یان ئاوایییەکی نوێ دروست بکرێت. بەڵام ئەگەر ژمارەکە کەمی کرد ئەوا پێویستە ژن و مێردەکان لە منداڵخستنەوەدا پاداشت بکرێن و سزایش بخرێتە سەر ڕەبەنەکان.

بەڵام دەرهەق بە سامان یەکسانی تەنیا لە دابەشکردنی پارچە زەوییە ڕاستەقینەکاندایە، واتە یەکسانی تەنیا لە موڵکایەتی زەویدا، ئینجا دوای ئەوە جیاوازی لە موڵکە کەسییەکاندا پەیدا دەبێت، بۆیە ئەفلاتون ڕێ بە هەر هاونیشتمانییەك دەدات موڵك و ماڵ و دەستکەوتێکی ئەوتۆی هەبێت کە بەهاکەیان چوار هێندەی بەهای زەوی بێت.. بەم جۆرە مەودایەك دەکەوێتە نێوان ئەو پیاوەی وەك کەمترین ڕادەی موڵکایەتی یەك پارچە زەوی هەیە و ئەو پیاوەی ئەم پارچە زەوییە و ماڵ و موڵکی تریشی هەیە[157]. لە بەرەنجامی ئەم جیاوازییە لە سامان‌دا کە ئەفلاتون لە "یاساکان"دا ڕێی پێ دەدات، سیستەمێك بۆ چوار چین دروست دەبێت کە لەسەر موڵکایەتی بەندە[158]. هاونیشتمانی هیچ بوارێکی دیکەی چالاکیی ئابووریی نییە، ڕێی پێنادرێت مومارەسەی هیچ پیشە و ئیشێکی تر بکات، یان ئامرازی نەشیاو بەکار بهێنێت بۆ کۆکردنەوەی سامان وەك کڕین و فرۆشتن..هتد، کە ئەم کارانە وا دەکەن سروشتە ئازادەکەی بکەنە سروشتێکی نزم و سووك، هەروەها ڕێ بە هاونیشتمانیش نادرێت زێڕ و زیو کۆ بکاتەوە[159].

بەلام ئەفلاتون بازرگانی و پیشەسازیی دەوڵەتی ڕەتناکاتەوە، بەڵکو لە هاونیشتمانیانی قەدەغە ئەکات و شوێنگەیەك بۆ ئەم پیشەیە دادەنێت بە مەرجێك ئەمە کاری تایبەتی ئەو بێگانانە بێت کە لەو دەوڵەتەدا دەژین، بۆ هاونیشتمانیش هونەر و سیاسەت و کار دەهێڵێتەوە بۆ بەرزکردنەوەی جەستە و عەقڵی تا ئاستی ناوازەبوون، هەروەها داچاندنی زەوی دەکاتە کاری تایبەتی کۆیلەکان و بازگانی و پیشەسازییش دەکاتە کاری تایبەتی بێگانەکان، ئەوەتا هێشتا بنەما سەرەکییەکەی "کۆمار" ماوەتەوە، ئەویش ئەوەیە: هەر مرۆڤێك دەبێت تەنیا یەك وەزیفەی هەبێت[١٦٠].

بەڵام پێویستە هاونیشتمانی ئەوەی لە زەیندا بێت کە زەوی، بە شێوەیەك لە شێوەکان هی دەوڵەتە (٧٤٠ أ) و زەوی لای خواوەندەکان پیرۆزە، بۆیەشە دەبێت وەك ئازیزبوونی منداڵ لای دایکی، ئەو زەوییەش لای هاونیشتمانییەکە ئازیز بێت، هەروەها دەبێت خاوەنداری زەوی ئەوەی لەبیر بێت کە هەموو یان بەشێك لە زەوییەکەی نە بۆ کڕینە و نە بۆ فرۆشتنە و نە بۆ دەست لێ هەڵگرتن. (٧٤١ ب)، و لەم ڕووەوە دەوڵەتیش توخنی ناکەوێت، خۆ ئەگەر هاونیشتمانی هەڵەیەکی وا بکات ئەوا بە یەك لەسەر چواری زەوییەکە پێ بژاردن (غەرامە) دەکرێت (٨٥٥أ ــ ب). بەڵام بەشە زەوییەکە دەبێت بۆ ئەبەدی هی ئەو هاونیشتمانییە بێت کە یەکەمجار پێی دراوە، ئینجا دوای خۆیشی بۆ میراتگرەکانی، جا ئەم میراتگرانە لە پشتی خۆی بن یان هەڵگیراوە (تەبەنی) بن، خاوەندارەکە ئەتوانێت بەشەکەی خۆی بۆ هەر کام لە نەوە کوڕەکانی کە خۆی بیەوێت بکاتە میرات (٧٥٤ب ــ ٩٢٣ ب). ئەگەریش تەنیا کچی هەبێت بۆی هەیە کوڕی هاونیشتمانییەکی تر هەلبژێرێت کە بیکاتە زاوای خۆی و ئینجا بیکاتە میراتگری دوای خۆی.(٩٢٣ د). خۆ ئەگەر وەچاخ کوێر بێت و نە کوڕی هەبێت و نە کچ، ئەوا مافی خۆیەتی نەوەی هاونیشتمانییەکی تر هەڵبژێرێت کە ببێتە میراتگری (٧٤٠ حـ). خۆ ئەگەر خۆ ئەگەر کەسی وەچاخ کوێر بە هۆی تاوانێکەوە بە دوورخستنەوە (نەفی)ی بۆ دەرەوەی شارەکە سزا درا ئەوا خزم و کەس

و کارەکەی خۆی و ژنەکەی لەگەڵ پاسەوان و کەهەنەکان کۆ دەبنەوە تاوەکو میراتگرێك دەستنیشان بکەن بۆ ئەو بەشە ماڵ و سامانەی بە بێ خاوەن ماوەتەوە (٨٧٧ حـ). لەبەرئەوەی بابەتی میرات لە ڕوانەی ئەفلاتوندا گرنگە بۆ دەرخستنی پێگەی ژن ئەوا دواتر دەگەڕێینەوە سەری تا بە درێژتر باسی لێوە بکەین.

دەبێت سەرنجی ئەوە بدەین دەستگرتنی دەوڵەت بەسەر ماڵ و سامانی تاکدا قەدەغەیە (٨٥٥ أ)، خۆ ڕەنگە بەرپرسەکان خۆیانی لیّ هەڵدەقورتێنن بۆ ناسینی میراتگرەکە یان کەسی جێنشینی خاوەندارەکە (٨٥ هـ)، بەڵام دەوڵەت مافی هەڵسوڕاندنی موڵکەکانی نییە، بەڵکو ئەنجومەنی خێزانەکە دەستنیشانی دەکات.

بەم جۆرە ئەفلاتون زۆر نزیك دەبێتەوە لە سیستەمی موڵکایەتی تایبەتەوە، ئەگەر چی لێرەدا هەر لە دەستی سەرۆك خێزاندا بووە کە وەزیفەکەی بەردەوامێتی خێزان و بەردەوامێتی خواپەرستییە (٧٤٠ حـ)، لە کۆتاییشدا گرنگە ئەوە دەربخەین "باوك" یان سەرۆك خێزان خاوەنی زەوییەکەیە و ئینجا دەیکاتە میرات بۆ کوڕەکەی، یان هەر نێرینەیەکی تر کە خۆی بیەوێت، یان مێردی کچەکەی..هتد، گرنگ ئەوەیە خاوەندارەکە پیاو بێت، ئەوەش لەبەرئەوەی ژنەکان و کچەکان، گەورە بن یان گچکە، هیچ یەکێکیان مافی خاوەندارێتی زەوییان نییە[١٦١].

## دووەم: خێزان و پێگەی ژن

### ١- گەڕانەوەی خاوەندارێتی:

لە دیالۆگی "یاساکان"دا مولّکایەتی تایبەتی دەگەڕێتەوە بۆ نێو کۆمەڵگە، پێویستە لەگەڵیدا خێزان و سیستەمی تەقلیدییانەی هاوسەرگیرییش پەیدا ببنەوە، سەرلەنوێش وەزیفەی "سروشتی"ی ژن سەر هەڵدەداتەوە، وەك چۆن دەسەڵاتی باوکیش لە خێزانی بەتریرکیدا دەردەکەوێتەوە و..هتد، بگرە دەبێت جارێکی دیکە میتۆلۆژیای یۆنانییش بگەڕێتەوە تاوەکو هاوسەرگیریی پیرۆز بکات «بە جۆرێك لە دیالۆگی یاساکاندا هیرای خواژن وا دەردەکەوێت هۆگری هاوسەرگیرییە، لەبەرئەوەی وەزیفەی سەرەکی ئەم خواژنە لە ئایینە یۆنانییەکاندا پاراستنی هاوسەرگیریی و مافەکانی ژن و مێردە، وێڕای خیانەتی چەندبارەی (زیۆس)ـیش کەچی ئەو هەر وەکو نموونەی پیرۆزی ئایدیاڵی هاوسەرگیریی چاوی لیّ کراوە»..[١٦٢]. بەم جۆرە دەبینین تەنانەت خاسیەتە میتۆلۆژییەکانیش لە "یاساکان"دا دووبارە دەردەکەونەوە، وەك ئەوەی لە داب و نەریت و بەگشتیش لە ترادسیۆنی یۆنانیدا باوبوون (بەتایبەتیش لە ئەسینا و سپارتەدا). لێرەشەوە ئەفلاتون گەیشتۆتە ئەوەی سزای پیّ بژاردن بەسەر هەر کەسێکدا بسەپێنێت کە هاوسەرگیریی ناکات یان شکستی تێدا دەهێنێت، وەك ئەوەی لە سپارتە هەبوو. «پاسەوانی پەرستگای هیرای خواژن ئەو غەرامانە کۆدەکاتەوە کە بەسەر ئەو کەسانەدا دەسەپێنرێت کە مارەییەکەیان ئێجگار زۆرە» (٧٤٤ أ ــ ب بەرگی ٤ ــ ص٣٤٢). ئەفلاتون پیرەژنان وەك سەرپەرشتیار دیاری دەکات بۆ چاودێریکردنی هاوسەرگیرییە نوێیەکان و زانینی ئەوەی ئایا ئەم هاوسەرگیرییانە هەر لە سەرەتاوە ئەرکی خۆیان بەرامبەر دەوڵەت جیّ بەجیّ کردووە یان نا (٧٨٤أ ــ ص٣٥٢). بەم جۆرەش "هاوبەشێتی لە ژن"دا لەگەڵ گەڕانەوەی مولّکایەتی تایبەتدا کۆتایی پێهات و بگرە تاك هاوسەرێتی بووە ئەرك!

بە شێوەیەکی گشتی بیرۆکەی هاوسەرگیریی لای یۆنانییەکان هەر بۆ تێرکردنی ئارەزووە کەسییەکان بوو، بەڵام لای ئەفلاتون هاوسەرگیریی نە لە "کۆمار" و نە لە "یاساکان"دا بۆ تێرکردنی ئارەزووە کەسییەکان نەبوو، بەڵکو ئەنجامدانی ئەرکی تایبەت بوو بەرامبەر بە خێزان و دەوڵەت. ئینجا کاتێك گەنجێك بەدوای هاودەمی ژیانیدا دەگەڕا نەدەبوو ڕۆمانسییەت بنوێنێت (تەنیا کوڕان بۆیان هەبوو بەدوای هاودەمی خۆیاندا بگەڕێن و کچەکان مافی ئەم کارەیان نەبوو، هەروەها غەرامەیش هەر دەخرایە سەر گەنجە زگوردەکان نەك نێرە "ڕەبەنەکان")، چونکە کۆمەڵگەی یۆنانی ئەمەیان بە "نەرگسییەت" دادەنا، بەڵکو دەبوو بەرژەوەندی خێزان و سوودی دەوڵەت ببنە ڕێنما و ڕێنیشاندەری. لێرەدا ئاساییە ئەم ئەرکە لە ژێر ڕۆشناییەکی بەهێزی ئایینیدا بخرایەتە ڕوو[١٦٣].

ئەفلاتون لە گوزارەیەکی هاوشێوەی گوزارەکەی "خوان"دا دەڵێت «هاوسەرگیریی ئەو ڕێگەیەیە کە تێیدا ڕەگەزی مرۆیی نەمریی تێدا مومارەسە دەکەن.. دەبێت پیاو سروشتە نەمرەکەی خۆی دووپات بکاتەوە بەوەی منداڵ و نەوەی خۆی جێ بهێڵێت تا لەدوای خۆی خزمەتی خواوەندەکان بکەن» (٧٢١ ب).

وێڕای ئەوە خێزان سەرچاوەی نەریتە ماوەکان لە پێشینان و یاسا نەنووسراوەکانە، کە ئەمانە لە هەر یاسایەکی نووسراو زۆر کۆنترن (٦٨٠ أ)، ئەفلاتون تەمەنی هاوسەرگیریی بۆ کوڕان و کچان بە هەمان ئەو جیاوازییەوە لە کۆمەڵگەی یۆنانیدا هەبوو دیاری دەکات، کوڕانی گەنج لە تەمەنی سی یان سی و پێنجساڵی (٧٢١ ــ ص٢٩١) وەلێ کچ لە تەمەنی شازدە یان بیست ساڵی (٣٨٥ ب ــ ٣٥٣لا)، خۆ ئەگەر هەتا ئەو تەمەنە گەنج هاوسەرگیریی ڕەت بکاتەوە ئەوا بە غەرامەیەکی دیاریکراو سزا دەدرێت، هیچ شتێکیش نەوتراوە لەبارەی ئەوەی ئەگەر کچ هاوسەرگیریی نەکات چی ڕوودەدات، وەك ئەوەی ئەمە هەر بوونیشی نەبێت ﴿هاوسەرگیریی بۆ کچ قسە هەڵنەگر بووە﴾. کچ دەبوو هەر هاوسەرگیریی کردبا و مافی ڕەتکردنەوەی نەبوو[١٦٤]. بە زۆریش نە بۆچونی وەردەگیرا و نە ڕاوێژیشی پێ

دەكرا. ئەفلاتون ئەڵێت: «دەبێت پیاو لە تەمەنی سی بۆ سی و پێنجساڵی هاوسەرگیریی بكات، خۆ ئەگەر ئەمە نەكات ئەوا غەرامەی بەسەردا دەسەپێنین، یاخود لەم یان لەو جیاوك و ماف بێ بەشی دەكەین، ئەمە یاسای هاوسەرگیریی سادەیە» (٧٢١ ب)، ئەو پێی وایە هاوسەرگیریی ئەركێكی پیرۆزە و وەك باسمان كرد لەڕێگەیەوە جاویدانەگی وەدی دێت.. «ئینجا كوفرە گەر پیاو خۆی لەم ناز و نیعمەتە بێ بەش بكات و بە ئەنقەست هەوڵ نەدات بۆ گەڕان بەدوای هاوسەر یان منداڵدا، خۆ هەر كەسێك یاسا پەیڕەو بكات نە لۆمە دەكرێت و نە گەردی لێ دەنیشێت، ئەستەمیشە غەرامەیەك بدرێت كە بڕەكەی ئەوەندە زۆر بێت، ئەمەش بۆ ئەوەی وا خەیاڵ نەكات ڕەبەنی سوودی پێ دەگەیەنێت و لێی دەحەسێتەوە».. (٧٢١).

## ٢- وەزیفەی ژن :

دەبێت دەوڵەت كۆمەڵێك پیرەژن هەڵبژێرێت بۆ سەرپەرشتیكردنی هاوسەرگیریی (ئەوەش ئەركێكی نیمچە هاوشێوەی ئەو كارەبوو كە پیرەژنەكانی ئەسینا بە كردەیی ئەنجامیان دەدا، ئەگەرچی لێرەدا وردەكارتر و ڕێكخراو تر بوو)، دەبوو ئەم كۆمەڵەش ڕۆژانە لە پەرستگای خواوەندەكانی ئەسینا كۆببوونایەتەوە بۆ باس و خواسی بابەتی هاوسەرگیریی و پێشكەشكردنی ڕاپۆرت لەسەر هەر كەسێك، نێر یان مێ، كە لە تەمەنی هاوسەرگیریدایە و یەكێكیش لە ئەندامەكان بینیویەتی خەریكی شتی ترە و بایەخ بەو ڕێنماییانە نادات كە بۆ پەیڕەویكردن لە یاساكان و تەواوكردنی ڕێوڕەسمی هاوسەرگیریی وتراون. ماوەی سەرپەرشتیكردنی ژن و مێردەكە وەختێك هاوسەرگیرییەكەیان بەرهەمدار بێت و وەچە بخاتەوە دە ساڵ زیاتر نییە. بەڵام ئەگەر هاوسەرگیرییەیە لەم ماوەیەدا بێ وەچەخستنەوە درێژەی كێشابوو، ئەوا خزم و كەس و كار و سەرپەرشتیاران ڕێنماییان دەكەن بۆ لێك جیابوونەوەیان ئەوەش لەبەر بەرژەوەندی خۆیان (٧٨٤)، واتە چاودێریكردنی دەوڵەت بەسەر هاوسەرگیرییەوە هەر بەردەوام بووە، بەڵام پەیڕەوكردنەكەی لێرەدا زۆر كاڵترە لە هی "كۆمار"، ئەوەی

لێرەدا بۆی گرنگە وەچەخستنەوە و ژمارەی دانیشتوانە «ژنان و سەرپەرشتیاران دەچنە نێو ماڵی هاوسەرە گەنجەکانەوە و کار دەکەن بۆ وەستاندنی گەمژەیی و هەڵەکانیان جارێك بە هەڕەشە و گوڕەشە و جارێك بە ڕەزایکردن، خۆ ئەگەر لەمەدا شکستیان هێنا ئەوا ڕاپۆرتی خۆیان دەدەن بە پاسەوانەکانی یاسا و پاسەوانەکانیش ڕێ لەو گەمژەییانە دەگرن».. (٧٨٤حـ ــ بەرگی ٤ ــ ل٣٥٢).

خۆ ئەگەر جیاوازی هەیە لە تەمەنی هاوسەرگیریی هەردوو ڕەگەزەکەدا، ئەوا لە تەمەنی دامەزراندنیشیان لە وەزیفە فەرمییەکاندا هەر جیاوازی هەیە ، ئەویش بۆ ژن چل ساڵی و بۆ پیاو سی ساڵی، بە هەمان شێوە لە بواری خزمەتی سەربازیشدا ئەم جیاوازییە هەر بەردەوام دەبێت، بۆ پیاو خزمەتی سەربازیی لەنێوان سی بۆ شەست ساڵاندایە، بۆ ژنیش —تەنانەت ئەگەر ئارەزووی لە خزمەتی سەربازیش بێت ــ ئەوا یان دەبێت لەدوای لەدایکبوونی چوارەم منداڵی یان پەنجا ساڵ تێپەڕێنێت ئینجا ئەچێتە ئەم خزمەتەوە، ئەمەیان بۆی شیاو و گونجاوترە (٧٨٥ب ــ بەرگی ٤ ــ ل٣٧٣).

ئێستە دەبێت کەمێك لەسەر ئەو گوزارشتەی ئەفلاتون بوەستین «تەمەنی دامەزراندن لە وەزیفە فەرمییەکاندا چل ساڵییە بۆ ژن و سی ساڵییە بۆ پیاو». ئێمە دەڵێین وێڕای جیاوازی تەمەنی دامەزراندن لەنێوان هەردوو ڕەگەزەکە لە وەزیفە فەرمییەکاندا، کە جیاوازییەکە تەنیا ئەو ڕاڤەیە هەڵدەگرێت ئەفلاتون پێی وابووە پێگەیشتنی عەقڵی ژن درەنگتر دەکەوێت، یاخود لە پێگەیشتنندا لە عەقڵی پیاو لاوازترە، من دەڵێم بە چاوپۆشی لەم تێبنییە دەبێت بپرسین ئەی "ئەو وەزیفە فەرمییانە" کامەیە کە تێیدا ژن دادمەزرێنرێت؟

ئێمە ئەوەمان زانی وەك نەریت لە ئەسینای ئەو کاتەدا کۆمەڵێك پیرەژن هەڵدەبژێردرێن بۆ سەرپەرشتیکردنی هاوسەرگیری، بەڵام ئەی ئەو ئیشە تازانەی تر کامانەن کە لە بەردەمی ژندا ڕەخساون؟ ئێرنست بارکەر وەڵامی ئەم پرسیارە بەم جۆرە دەداتەوە: «وێڕای دانپێدانانی ئەفلاتون بەو خزمەتانەدا کە ژن بە دەوڵەتی

دەکات، کەچی لە "یاساکان"دا هیچ باسێك لە هیچ وەزیفەیەکی حکومەت ناکات کە پشتی بەوان بەستبێت، یان باس لە دەنگدانیان لە جڤاتەکەدا ناکات.

ڕاستە هەندێك لە ژنان وەك فەرمانبەری دەوڵەت ئیش ئەکەن بەڵام ئەم کارەیان تەنیا لە چوارچێوەی کاروبارەکانی هاوسەرگیریدایە، ئیدی لە "یاساکان"دا شتێکی لەم بابەتە لەبارەی بوونی پاسەوانانی ژن باس نەکراوە کە پێشتر لە "کۆمار"دا باسی کردبوو»[١٦٥].

مۆرۆ سەرسامە بەم بوارە بەرتەسکەی کە ئەفلاتون بۆ بەشداریکردنی ژنانی لە کۆمەڵگەدا ڕەخساندوە، ئەو نە لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتدا بەشدارییان پێ دەکات و نە لە فەرمانڕەواییدا و نە لە ژیانی سیاسی و نە لە هیچ دەنگدانێکدا..هتد وەك ئەوەی لە "کۆمار"دا باسی کردبوو، ئەوەتا لێرەدا ئیدی سروشتی پیاو ژن یەك سروشت نییە، ئایا لەگەڵ بارکەردا بڵێین ئەفلاتون «ئەم لایەنەی لەبیرکردووە، یان هیچ لە یادەوەریی ئەودا نەماوەتەوە جگە لە وێنەیەکی کاڵ کە وای لێ کردووە بڵێت: "ئەگەر ژنان فەزیلەتی ناوازەیان لێ دەرکەوت ئەوا دەبێت ستایش بکرێن وەك چۆن پیاوان ستایش ئەکرێن" (٨٠٢ أ). یان دەشێت بیرکردنەوەی لەسەر ژیانی خێزان چڕ کردبێتەوە کە لە "کۆمار"دا دووری خستبۆوە، بەڵام لە "یاساکان"دا بە بێ کەم و کوڕی ئەیهێڵێتەوە و هیچ چالاکییەکی سیاسییش پەسەند ناکات کە ژن ئەنجامی بدات»[١٦٦]. ئەو پرسە ئێجگار گرنگە لەبەرئەوەی ئەوە دەسەلمێنێت کە پێشتر لەبارەی یەکسانی نێوان هەردوو ڕەگەزەکەی نێو دیالۆگی کۆمارەوە باسمان کرد، لەوێدا موڵکایەتی و خێزان بزربوون و ڕۆڵی تەقلیدییانەی ژنیش ون بوو بۆیە ژن کرا بە ژنێکی پیاوانە، ئینجا کە موڵکایەتی و خێزان دەگەڕێتەوە ڕۆڵی ژنیش وەك ئەوەی پێشتر هەبوو دەگەڕێتەوە، ژنانیش لە بواری ژیانی سیاسی و بەشداری فەرمانڕەوایی و بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت تەواو پەراوێز دەخرێن.

بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا بارکەر پێی وایە ئەفلاتون زۆر شتی لەبەرژەوەندی ژن ئەنجامداوە ئەگەرچی لە چالاکی و سیاسی و بەڕێوەبردنی دەوڵەتیش دووری

خستۆتەوە، ئەو —واتە ئەفلاتون ــ «هێشتا پێی وایە دەبێت ژنیش وەك پیاوان هەمان فێرکردنیان هەبێت.. هێشتایش پێی وایە دەبێت ژنان لە ڕێگەی سیستەمی خوانە هاوبەشەکانەوە بچنە نێو ژیانی گشتییەوە، هێشتایش پێی وایە دەبێت هاوسەرگیریی لە پێناو بەرژەوەندی گشتیدا ملکەچی چاودێریی بکرێت»..[١٦٧]. من پێم وایە بابەتەکەی کۆتاییان —هاوسەرگیریی ــ پەیوەندی بە بەرژەوەندی ژنەوە نییە، بەڵکو دواتر دەبینین ئەفلاتون هەر وا تەماشای ژن دەکات کە نوقسانە و پێویستی بە سەرپەرشتە. بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە "بارکەر" خۆی دەڵێت ئامانج لە هاوسەرگیریی بەرژەوەندی دەوڵەت بووە. ئەوەی دەمێنێتەوە "فێرکردن" و "خوانە هاوبەشەکان"ــە کە پێویست دەکات بەخێرایی چەند وشەیەك لەبارەی هەر یەکێکیانەوە بڵێین.

### ٣- پەروەردە و فێرکردن:

دەبێت هەر لە سەرەتاوە بڵێین لەو سەردەمەدا بابەتی فێرکردنی ژن هەر خۆی لە فەزای فەرهەنگی یۆنانیدا جێی باس و خواس بوو و زۆر ئەدیبی وەکو "یۆربیدس" و "ئەرستۆڤان" و ئەوانی تر لە شانۆکاندا تاوتوێیان کردووە[١٦٨].

بەڵام ئەو فێرکردنەی کە لە بۆچوونی ئەفلاتوندا بۆ ژن خراوەتە ڕوو هەمان فێرکردنی پیاوانە کە لە یاساکاندا پیشانی داوە، هەر ئەمەیە ئێمە زۆر گومانی لێ دەکەین.. ترادسیۆنی یۆنانی فێرکردنی کردبوو بە دوو بەشی گەورەوە: بەشێك پەیوەستبوو بە جەستەوە، ئەویش ڕاهێنانە وەرزشییە هەمە جۆرەکان بوو، بەشێکیش پەیوەندی بە روحەوە هەبوو، ئەویش میوزیك و ئەدەب و هونەری دەگرتەوە و دواتر بیرکاریشی خرایە سەر، جا با ببینین ئەفلاتون لەبارەی فێرکردنی ژن و پیاو و گەشەپێدانی جەستە و ڕوح لای ئەو دوو ڕەگەزە، چی دەڵێت.

أ- ئەفلاتون پێی وایووە دەبێت مەشقی ڕاهێنانە وەرزشییەکان بە کچان بکرێن، بەڵام لە زۆرێك لەو ڕاهێنانە دەکشێتەوە کە لە "کۆمار"دا باسی کردووە، ئەوەتا بۆ نموونە دەکرێت کچۆڵەیەکی منداڵ بەرلەوەی بگاتە قۆناغی باڵغبوون بە

ڕووتی مەشقی پێ بکرێت، بەڵام هەر کە دەگاتە ئەم قۆناغە یەکسەر ئەفلاتون پۆشینی جلی گونجاوی بەسەردا دەسەپێنێت «ئەو کیژانەی تەمەنیان دەگاتە سێزدە ساڵان و هێشتا چاوەڕوانی هاوسەرگیریی دەکەن.. ئەوا دەبێت ئەو کچانە پۆشاکی گونجاو بپۆشن کاتێك لەم کێبەکێیانەدا بەشداری دەکەن» (٨٣٣ حـ ــ ل٤٠٠).

هەورەها سیستەمی تێکەڵ لە فێرکردندا تەنیا لە تەمەنی منداڵیدا بەردەوام دەبێت هەتا ساڵی شەشەمین.. «دوای شەش ساڵان ئیدی وەختی لێکجیاکردنەوەی هەردوو ڕەگەزەکەیە تا کوڕەکان لەگەڵ کوڕان و کچەکانیش لەگەڵ کچان بە هەمان شێواز بژین، ئیدی ئێستا دەبێت فێر بکرێن: کوڕەکان دەڕۆن بۆ لای ڕاهێنەرەکانی ئەسپ سواری و ڕمهاوێژی و بەکارهێنانی قەڵغان و زرێپۆش، هەروەها کچانیش ئەتوانن ئەمە بکەن ئەگەر سەرکەوتوو بوون و ناڕازی نەبوون لەسەر بەشداریکردنیان».. (٧٩٤ب ــ جـ ــ بەرگی ٤ ــ ل٣٦٠ ــ ٣٦١).

ئەفلاتون ڕەخنە لە یاسادانەری سپارتە دەگرێت بەوەی گرنگیدانی بە ڕاهێنانی سەربازییانەی ژنان فەرامۆش کردووە «شورەییەکی گەورەیە بۆ دەوڵەت گەر مەشق بە ژنەکانی نەکات یان مەشقێکی خراپیان پێ بکات، بە جۆرێك کە جوامێریی مریشك یان باڵندەیەکیان نەبێت کە لە بەردەم مەترسی دڕەندەکان یان هەر مەترسییەکی تردا بەرگری لە بێچووەکانی دەکات، ژنان ئەگەر ڕوویان لە پەرستگاکان کرد و لە دەوری سەربڕینگەکانی قوربانی و گۆڕلێدان خڕبوونەوە مانای لە وەختی مەترسیدان، چوون بەمە عەیب و عار ئەلکێنن بە ڕەگەزی مرۆییەوە بەوەی ترسنۆکترین بوونەوەری زیندوو دەبن».. (٨١٤ب ــ ل٣٨٢). ئەو ئەیەوێت ژن بەرگری لە دەوڵەت نەکات چونکە ئەمە ئەرکی پیاوانە، بەڵکو ئامادەیی بەرگریکردنی لە بێچووەکانی هەبێت وەك هەر دایکێکی تر و هەمان ئەو کارە بکات کە باڵندەکان بۆ بەرگریکردن لە فەرخەکانیان ئەیکەن.

لەگەڵ ئەوەیشدا ئەمە ناکاتە مەرجێکی سەپێنراو و ناچاری یان گشتی بەڵکو پێشنیارە، تەنیا پێشنیارە و دەیخاتە ڕوو بۆ ئەو ژنانەی لە حاڵەتی کتوپڕدا

پێویستییانە بۆیە بە ڕوونی دەڵێت «ناکرێت ژنان ناچار کرێن بە یاسا و ڕێوڕەسم بەشداریی لەم مەشقانەدا بکەن. بەڵام خۆ ئەگەر ڕاهێنانە زووەکانیان ببنە مایەی گەشەسەندنی ئەم نەریتە و ببنە خاوەنی توانای پێویست بۆ هاوبەشیکردنی پیاوان، ئەوا بێ لۆمە و تانە و تەشەر ڕێی ئەم کارەیان پێ دەدرێت».. (٨٣٤حـ ــ بەری ٤ ــ لا٤٠١). ئەمەش وەك سۆزان ئۆوکین دەڵێت[١٦٩]، واتای ئەوەیە ئەفلاتون هەرە زۆری ژنان لە خزمەتی سەربازی دووردەخاتەوە، مەگەر ئەو کاتە نەبێت کە بە ڕەزای خۆی بێت، ئەمە لە کاتێکدا بۆ کوڕان و پیاوانی گەنج ناچارییە.

"مۆرۆ" لە ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاهێنانە جەستەییانە، وەرزشی یان سەربازی، دەڵێت: «بەڕاستی زۆرسەیرە ئەمە تێڕوانینی ئەفلاتون بێت بۆ ژن، وێڕای ئەوەی کە زانیویەتی بوارگەلێکی زۆر بەرفراوانتر هەن کە دەکرێ ژن بەشدارییان تێدا بکات و بەشداریش لە کۆمەڵگەدا بکات کەچی جێی سەرسوڕمانە جەخت لەسەر کایەیەك دەکاتەوە کە واپێدەچێ بۆ ژنان زۆر گونجاو نییە بەوەی خاوەنی جەستەیەکی لاواز و ناسکۆڵەیە، پاشانیش دەڵێت ئەمە بەشدارییەکی ئاساییە. منیش دەڵێم ئەفلاتون جەخت لەسەر ئەم کایە دەکاتەوە، نەك لەبەر ئەوەی لەو کایانی دیکە بێ ئاگا بووە کە ئەکرێت ژن بەشدارییان تێدا بکات، بەڵکو وەك خۆی ئاماژەی پێداوە ژنان دەتوانن لە هەموو چالاکی و ئەرکێکی دەوڵەتدا بەشدارییەکی ئێجگار زۆری پیاوان بکەن (٨٠٥حـ ــ و هەروەها ٨٠٦)، نەخێر، ئەو بێ ئاگا نەبووە لە جیاوازییە جۆرییەکانی سروشتی جەستەیی نێوان ژنان و پیاوان»[١٧٠].

واتای ئەمەش ئەوەیە ئەفلاتون پێی وایە بەشداریی سروشتی ژنان بە ڕادەی یەکەم لە "ماڵ"ـدایە، بەڵام ئەگەر ویستی هاوشانی پیاوان بەشداریی بکات، ئەوا دەبێت بۆخۆی پیاوێك بێت، یان لایەنی کەم "ژنێکی پیاوانە" بێت. لەگەڵ هەموو ئەوانەیشدا، وەك کەمێك لەمەوپێش وتمان، پرسەکە بۆ هەر ژنێك بیەوێت ببێتە پیاو "ئارەزوومەندانە"یە نەك ناچارییانە «ئەوەش ناکرێت تا منداڵی چوارەمی نەبێت، یان بە جۆرێك کە ژنەکە پەنجا ساڵیی تەمەنی تێپەڕاندێت» (٧٨٥ب ــ ص٣٥٣).

ب- بەلام بەنیسبەت لایەنەکەی تری پەروەردە کە میوزیکە، لێرەشدا یەك جۆرە پەروەردە نابینینەوە، بەڵکو دەبینین هەردوو ڕەگەزەکە لێك جیاکراونەتەوە، ئەو دەڵێت «دەبێت بەرمەبنای هەندێك پرەنسیپی گشتی ئەوە دیاری بکەین کە چ جۆرە گۆرانییەك لەگەڵ ژنان دەگونجێت و چ گۆرانییەکیش لە گەڵ پیاوان، پاشان دوای ئەوە نۆتە و ڕیتمە گونجاوەکان بۆ هەر ڕەگەزێك هەڵدەبژێرین».. (٨٠٣ ــ ص٣٧٠). ئینجا ئەو میوزیکەمان پێ ئاشنا دەکات کە بۆ هەر ڕەگەزێکیان دەست دەدات «هەرچی ئەو ئاوازنەی تایبەتن بە ژنان ئاماژەن بۆ لێکجیاکردنەوەی نێوان هەردوو ڕەگەزەکە.. ئینجا هەقی خۆیەتی بڵێین ئەو ئاوازانەی بەرەو شکۆداریی ئاراستە دەبن و هەستی جوامێریی و ئازایەتی دەبزوێنن ئاوازی تایبەت بە پیاوانن، بەلام ئەو ئاوازانەی بەرەو میانەگیری و هارمۆنیا و خۆکۆنترۆڵکردن و ئاوازە هێمنەکانمان دەبەن ئاوازەکانی تایبەت بە ژنانن. ئەمە هەم یاسا دایناوە و هەمیش داب و نەریت پەسەندی کردووە. لەسەر ئەمەشەوە سیستەمە گشتییەکە دروست دەبێت کە دەبێت پەیڕەویی لێ بکەین (٨٠٣ ــ لا٣٧٠). ئەم جیاوازییە کە ئەفلاتون ئاماژەی بۆ دەکات هەڵگری ناوەڕۆکێکی گرنگە، ئەمەش لەبەرئەوەی کتومت ئەمە خەسڵەتەکانی ژنانە کە لە پەرەگرافێکی پێشووی دیالۆی یاساکاندا باسی کردووە (٦٢٨ و دواتر)، گوتووشیەتی دەوڵەت پێویستی پێیەتی و ئینجا بۆ ئایدیالی سپارتەیشی بە شوورەیی زانیووە کە ئەمەی فەرامۆش کردووە[١٧١]. لە دیالۆگی "یاساکان"دا وەك سارە بۆمیرۆی دەڵێت، ئەفلاتون بەتەواوی ڕۆڵە تەقلیدییەکەی هەردوو ڕەگەزەکە دەگەڕێنێتەوە و مێیینە دەکاتە بوونەوەری گوێڕایەڵ و خاکەڕا و تەمبێکراو، پیاویش دەکاتە کەسانی سەرکێش و خەباتگێڕ و جەستوور[١٧٢].

### ٤- خوانە هاوبەشەکان:

دەرهەق بە خوانە هاوبەشەکان، ئەفلاتون ئێجگار زۆر خوازیاری بووە، ڕەنگە بەهۆی کاریگەری سپارتەوە یان کاریگەری بنەماڵە بالاکانی ئەسیناوە بووبێت «من

به پێداگرییەوە دەڵێم پێویستە ئەو پیاوانەی تازە ژنیان هێناوە لە سەر خوانێکی هاوبەش کۆببنەوە، ڕێك وەکو ئەوەی پێشتر لە هاوسەرگیریدا ساز دەکرا، بە بێ کەم و زیاد» (٧٨٠-٣٤٨).

بەڵام ئەفلاتون لە دیالۆگی "یاساکان"دا لە ــ زمانی ئەسینایییەکەوە ــ ئەم بیرۆکەیە بۆ ژنانیش درێژ دەکاتەوە و عەیب دەخاتە پاڵ سپارتە کە خوانە هاوبەشەکانیان تایبەت کردووە بە پیاوان. «ڕاستییەکەی سیستەمی خوانە گشتییەکانی پیاوان سیستەمێکی نایابە و خەڵاتێکی ئاسمانییە. بەڵام هەڵەیە بێ ڕێکخستنێکی ئەوتۆ کە یاسا دیاری بکات لە ژنان گەڕێین، خۆ ئەوان سیستەمێکی هاوشێوەی خوانی هاوبەشییان نییە کە بە ڕۆژی نیوەڕۆ ساز دەدرێت.

کاتێکیش ئەم ڕەگەزە مرۆییە کە بەهۆی لاوازییەکەوە —مەبەستیشم لێی ڕەگەزی مێیینەیە ــ بە سروشت مەیلی نهێنیکاریی و دزەکردن ئەکات، یاساڕێژی (سپارتە) تەنیا و بێ ڕێکخستن لێیان گەڕاوە. لەمەدا هەڵەی کردووە. لە بەرەنجامی ئەوەیشەوە کاروبارێکی زۆر لای ئێوە بە دەڵەمەیی گەشەی کردووە، دەکرا ئەمانە باشتر بوونایە ئەگەر لە ڕێگەی یاساوە ڕێك خرابان. چونکە فەرامۆشکردنی ڕەگەزی مێیینە تەنیا فەرامۆشکردنی نیوەی کۆمەڵگا نییە بەڵکو بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی سروشتی توانای ژن بۆ دەستڕاگەیشتنی فەزیلەت لە سروشتی پیاو خوارترە، ئەوا دەرەنجامەکانی ئەم فەرامۆشکردنە دوو هێندە دەبێتەوە» (٧٨١ أ ــ ب ــ بەری ٤ ــ ٣٤٩ل).

ئەمە دەقە بەناوبانگەکەی دیالۆگی یاساکانە کە "بارکەر" وای دەبینێت بانگێکە بۆ ژن تا بەشداریی لە ژیانی گشتیدا بکەن، کەسانێکی دیکەیش وای دەبینن "ئازادبونی نیوەی کۆمەڵگەیە" لە زیندانیی ماڵ. ئەگەرچی بۆ نموونە ئەرستۆش باسی لەوە کردووە کە ژن نیوەی کۆمەڵگەیە و ژن و پیاو پێکەوە خێزان دروست ئەکەن و هەردووکیشیان پێکەوە دوو نیوەکەی دەوڵەتن[١٧٣] و ئەمیش بانگەشەی بۆ بایەخدان بە خوانە هاوبەشەکان بۆ سەرجەم هاونیشتمانیان کردووە[١٧٤]،

کەچی هیچ کەسیش نەیوتووە ئەرستۆ بانگەشەی ئازادبوونی ژن یان یەکسانی لەگەڵ پیاودا کردووە. ڕاستە ئەفلاتون فەزلی هەبووە لە درێژکردنەوەی ئەم خوانە بۆ ژنانیش وەك ئەوەی ئەرستۆ خۆی دانی پێدا دەنێت[١٧٥] (ئەگەرچی ڕاستتریشە بڵێین بۆ خێزانی درێژکردەوە) «بەڵام خاڵی سەرەکی ئەوەیە ئەو پێی وابووە ژەمە هاوبەشەکان ئامرازگەلێکی گرنگن بۆ پەروەردە و ڕێکخستن، ئەو یاسادانەرەیشی بۆ خوانێکە لەم جۆرەی خوانی هاوبەشی پیاوان بۆ ژنانیش دانەنێت، ئەوا نیوەی کارەکەی و ڕەنگە زیاتر لە نیوەیشی فەرامۆش کردووە، لەبەرئەوەی پۆتێنشیالەتی سروشتی ژن بۆ فەزیلەت لە هی سروشتی پیاو نزمترە) (٧٨١ أ). جا لەمەشەوە فاسدبوونی ژنان دوو هێندە دەبێت، بۆیە ئەم پیاوە ئەسینابییە دواجار جەخت لەسەر ئەم خاڵە دەکاتەوە کە ناوازەیی ئەم پێشنیارە سەروەختی دارشتنی یاسای تایبەت بە خوانی هاوبەش دەردەکەوێت (٧٨٣ ب).

بۆ بەدبەختی ئەو بەڵێنەی ئەفلاتون (واتە ئەو بەڵێنەی سەرەوە کە دارشتنی یاسای تایبەت بە خوانی هاوبەش بوو. —و. ك-) بەخۆیی دا هەرگیز وەدی نەهات.

بەڵام دەبێت ئێمە ئەوە بە زەینی خۆماندا بهێنین کە خوانی هاوبەش جۆری زۆری هەبووە نەك تەنیا یەك جۆر. خوانی هاوبەشی گشتی هەبووە بۆ دادوەران کە لە وەختی کاردا نانی خۆیانیان لەسەر خواردووە، «نابێت هیچ کەسێکیش یەك ڕۆژ ئامادە نەبێت مەگەر بە پاساوێکی زۆر بەهێز» (٨٦٢ هـ) خوانی هاوبەشی ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران (٧٥٨ حـ) وەك ئەوەی لە ئەسینادا هەبوو، هەروەها ژەمی هاوبەشی تر هەبوو بۆ فەرمانبەرە فەرمییەکان و ماڵی وا بۆ نان خواردن هەبوو لە نادی ئەچوو، وەك ئەوەی لە سپارتە هەبوو، ئەم خوانانە پیاوان و خێزانەکانیانی ئەگرتەوە، واتە کچان و دایکانیش بەو مەرجەی لە سەر سفرەکە بە جیا دابنیشن بەڵام دوور لە سەرۆك خێزانەکە نا (٨٠٦ هـ ـــ ٣٧٤لا). لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کچان لەگەڵ دایکانیاندا بەشداری لەم ژەمە گشتییانەدا دەکەن، هەروەها منداڵە کوڕەکانیش —بەتایبەت چکۆلەکان ـــ لەگەڵ دایکاندا ئەم ژەمانەیان دەخوارد. بەڵام

لە شەش ساڵی بەرەو سەر دەبێت کوڕان لە کچان جیا بکرێنەوە وەك ئەوەی لە وانەکانی پەروەردەدا هەبوو. ئیدی دەبوو کوڕەکان لەگەڵ باوکەکانیاندا نان بخۆن.

پێدەچێت ئەفلاتون وا سەرنجی لەم ماڵانە نەدابێت کە شوێنی نان خواردن و شتی تریشن، ئەندامەکانیش دوای نانخواردنی ئێوارە ئەگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆیان[١٧٦]. خوانێکی هاوبەشی لەم جۆرە پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە ژیانی گشتی شارەوە نەبوو، لە ڕاستییەوە نزیکترین گەر بڵێین خێزان ژەمەکەی لە چێشتخانە خواردووە. مەسەلەکە هەر ئەوەیە ئەفلاتون بەسەر سەرۆك خێزانیدا سەپاندووە خێزانەکەی ببات تا پێکەوە بەڵام بە جیا لەسەر سفرە نان بخۆن (تەنیا ژنانی حەرەمسەراکان لەگەڵ منداڵەکان دەبوون)، بەڵکو ئەفلاتون پێشبینی بەرگریش دەکات لە لایەن ژنانەوە «ئەمەش ناچارمان ئەکات بە زۆر ڕازیی بکەین بۆ خواردنەوەی شەراب و خواردنی گۆشت لە ناوەڕاستی خەڵکەکەدا».. ئەی چی لە ڕەگەزێك چاوەڕوان بکەین کە لە سووچێکی تاریکی ژیاندا هاتۆتە ژیانەوە؟ هەوڵ بدە ژن ڕازی بکەیت بەوەی بێتە دەرەوە بۆ بەر ڕۆشنایی ڕۆژ، جا ئەو کات دەبینیت چ بەرگرییەکی ئێجگار توند دەکات. (٧٨١ هـ).

ئەمە نە وەزیفەی ژنە و نە بەشداریکردنیشیەتی لە ژیانی گشتیدا. ڕاستییەکەی تاکە وەزیفە (وەك لە کۆماردا هاتبوو، دەبوو هەر کەسێك یەك وەزیفەی هەبێت) کە دەکرێت لە دیالۆگی یاساکانەوە ئەنجامگیریی بکەین ئەوەیە کە ژن ببێتە (هاوسەر و دایك)ێك منداڵەکانی بەخێو بکات و بەرگرییان لێ بکات وەك بەرگریکردنی تەیروتور لە فەرخەکانی. تاکە وەزیفەیەك کە لەدوای پەیدابوونی خێزان و بزربوونی ژن لە کایەی سیاسیدا مابێتەوە بریتییە لە وەزیفەی (کەیبانووی ماڵ) و ژیانکردن لەو سوچە تاریکەی ژیاندا، سوچی حەرەمسەرا. ئەمە لەگەڵ هەوڵی حەواندنەوەی جاروباریان بە چوونە دەرەوە بۆ نان خواردن لە دەرەوەی ماڵ. «ژنان لە دیالۆگی یاساکاندا، کاتێك زەواجی تاکهاوسەری بۆتە ئیجباری زیاتر لەلایەنی وەزیفە بایۆلۆییەکەیانەوە سنووردارکراون »..[١٧٧]. خۆ ئەگەر ژن بگاتە "تەمەنی

خانەنشینی" واتە پەنجاساڵی تێپەڕێنێت، بۆی هەبوو دوای چوارەم منداڵی بە هەڵبژاردنی ئازادانەی خۆی بەشداری لە خزمەتی سەربازیدا بکات، یان هەڵیبژێرین بۆ لیژنەی سەرپەرشتیکردنی هاوسەرگیریی، ئەویش لیژنەیەك بوو کاری هەمان کاری ئەو پیرەژنانەی ئەسینا بوو کە پێشتر باسمان کرد. زۆریش سەیرە ئەفلاتون ئەوەی لە ژن قەدەغەکردووە ببێتە سەرپەرشتیاری پەروەردەکردن..[١٧٨]. مەرج بوو هەر کەس بچێتە ئەم پێگەیە دەبێت پیاو بێت و تەمەنیشی لە پەنجا کەمتر نەبێت و دەبێت باوکی خێزانێك بێت و وا باشتریشە منداڵی لە هەردوو ڕەگەزەکە هەبێت».. (٧٦٥هـ ـــ بەری ٤ ـــ ل٣٣٣).

## سێیەم: دەسەڵاتەکانی پیاو

لە دیالۆگی "یاساکان"دا پیاو ئەو کەسەیە بۆ بەرگریکردن لە دەوڵەت دەجەنگێت، ژنیش بە تەواوی بڕیاری خۆی "واتە خۆبەخشانە" تەنیا بۆ بەرگریکردن لە منداڵەکانی تێدەکۆشێت و پیاویش ئەرکی بەرگریکردن لە ژنەکەی و تەواوی کۆمەڵگەی لە ئەستۆیە، ئینجا پیاو یاساکان دادەنێت و هەر ئەویش جڵەوی فەرمانڕەوایەتی هەڵدەسوڕێنێت و پیادەی ژیانی سیاسی ئەوپەڕی گرنگ لای یۆنانییەکان دەکات، پاش ئەم بێنە و بەردەیەش هەر ئەوە خاوەنی زەوی و سەرۆکی خێزان.

### ١- پێگەی باوك:

کاتێك موڵکایەتی تایبەت گەڕایەوە لەگەڵیشدا خیزان پەیدابوویەوە و تاك هاوسەری و ئینجا بیرۆکەی میرات و پاراستنی میراتگر و سزاکانی زییناکردن و..هتد گەڕانەوە. هەروەها دەسەڵاتی بەرفراوانی باوك تەنانەت لەنێو خێزانیشدا دەرکەوت، ئەمە وێڕای دەسەڵاتەکانی لە دەرەوەی خێزان و لەنێو ژیانی گشتیدا وەك یاسادانەر و دادوەر و..هتد، بەم جۆرەش پێگەی ژن بەرەو کاڵبوونەوە چوو، باوك بووە کەسێك کە دەبوو بە ناچاری ڕێزی لێ بگیرێت «بەشێوەیەکی گشتی پیرەکان لە گەنجەکان و باوکان لە منداڵەکانیان و پیاوان لە ژنان[١٧٩] و منداڵان و فەرمانڕەوایان لە گەلەکەیان پێگەیان بەرزترە.. ئەم ڕێزگرتنە واجبە بەرامبەر هەر کەسێکیش کە لە ناوەندی دەسەڵاتدایە».. (٩١٧أ ــ لا٤٨٧) ــ هەموو ئەو کەسانەیشی لە دەسەڵاتدا بوون پیاوان بوون.

ڕاستییەکەی دەسەڵاتی باوك لە دیالۆگی یاساکاندا جیاوازییەکی زۆری نەبوو لەگەڵ ئەو دەسەڵاتە باوکسالارییەی کە پیاوی ئەسینایی هەیبوو. بۆ نموونە ئێمە دەبینین ئەفلاتون مافی بەرگریکردنی منداڵ لە خۆی لە دژی باوکی بە ڕەوا نابینێت

(٨٧٩حـ)، خۆ ئەگەر یەکێك لە منداڵەکان جەسووری ئەوە بکات باوکی بخاتە هەڵوێستێکی ناخۆشەوە، ئەوا بڕیاری سزادان بۆ کۆمەڵێك دادوەر جێ دەهێڵرێت کە ژمارەیان لە شەست دادوەر زیاترە و خۆیان خاوەنی منداڵن لە پشتی خۆیان نەك منداڵی تەبەنی، خۆ ئەگەر منداڵەکە ﴿لەلایەن ئەم دادوەرانەوە﴾ سەرزەنشت کرا ئەوا سزای مردن یان سزایەکی لە مردن بە ئازارتری بەسەردا دەسەپێنرێت. دەبێت لە هەموو حاڵێکدا زۆر لەمە کەمتر نەبێت (٨٧٨هـ ــ بەرگی ٤ ــ ل٤٤٧)، بگرە ئەفلاتون مافی ئەوەی بە باوك داوە یەکێك لە نەوەکانی ببەخشێتە کەسێکی تر کە قەبووڵی تەبەنییەکەی بکات (٩٣٣حـ).

### ٢- ژنی پێنەگەیشتوو:

ژن بە درێژایی ژیانی پێویستی بە "سەرپەرشت" هەیە، ئەو لە ماڵی بابی لەژێر چاودێری و سەرپەرشتیدایە، باوك تاکە کەسی سەرپشکە لە بەشوودانی کچ. ئەو کەسەیشی کە مافی پیادەکردنی کاوربارەکانی دەستگیرانداریی و بەڵێننامەی هاوسەرگیریی کچەکەی هەیە هەر بە پلەی یەکەم باوکە. خۆ ئەگەر باوك ئامادە نەبێت، بە پلەی دووەم باپیر، خۆ ئەگەر هەردووکیان ئامادە نەبوون ئەوا ئەو کەسەی مافی هەڵسوڕاندنی کاروبارەکانی دەستگیرانداریی و بەڵێننامەی هاوسەرگیرییەکەی هەیە براکانی باوکن».. (٧٧٥ بەرگی٤ ــ ل٣٤٣). بەم جۆرە دەبینین یاسای ئەسینایی کە ژنی بە پێنەگەیشتوو داناوە دەبێتەوە بار و مەینەتی بەسەرییەوە. «ئەم یاسایە وا لە ژنی دەڕوانی کە کەسێکی پێنەگەیشتووە و دەبێت بە درێژایی ژیانیش بە پێنەگەیشتوویی بمێنێتەوە، کچ پێنەگەیشتووە و لەم حاڵەتەدا لەژێر سەرپەرشتیی باوکیدایە، لەگەڵ هاوسەرگیریشدا سەرپەرشتیکردنی لە باوکەوە دەگوازرێتەوە بۆ مێردەکەی و ئەگەریش بێوەژن کەوت دەکەوێتە ژێر سەرپەشتی کوڕەکەیەوە».. [١٨٠]. کتومت ئەمە ئەو شتەیە ئەفلاتون لە "دیالۆگی یاساکان"ـدا ئەنجامی داوە، ئەو هەرگیز مافی ئەوەی پێنادات وەك مرۆڤێکی پێگەیشتوو و عاقڵ مومارەسەی ژیانی

خۆی بکات. ئەو ڕای لە بارەی دەستگیرانداریی و هاوسەرگیرییەوە نییە و لە بەرڕووداوەستانەوەی پیاودا (هاوسەر، باوك، دادوەر..هتد) خاوەنی کەسایەتی خۆی نییە و مافی ئەوەیشی نییە لە بەردەم دادوەراندا بەرگری لە خۆی بکات.

بڕوانە ئەفلاتون چی دەڵێت: «ژنی ئازاد ئەگەر چووبێتە سەرووی چل ساڵییەوە شایەنی ئەوەی هەیە لە بەردەم دادگادا بێ بەرگریکردن بە شایەتحاڵ وەربگیرێت، خۆ ئەگەر مێردی نەبێت شیاوێتی بەرزکردنەوەی کێشەکەی هەیە. بەڵام ئەگەر مێردی هەبوو تەنیا شاهیدی دەدات و تەواو. کۆیلە لە هەردوو ڕەگەزەکە و منداڵیش شایەنی ئەوەن بە شایەتحاڵ وەربگیرێن» (٩٣٧أ). سەرنج بدەن ئەفلاتون مافی ئەوە بە ژن نادات بچێت بۆ دادگا مەگەر بۆ شایەتیدان نەبێت، تەنیا لەکاتێکدا کێشەکەیشی بۆ بەرز دەکرێتەوە کە بێ مێرد یان بێ سەرپەرشت بێت. یاخود ژن لەسەرەتاوە لەژێر سەرپەرشتیی باوکی و ئینجا باپیر یان مام یان یەکێك لە پیاوانی خزمی نزیکدایە، خۆ ئەگەر گوازرایەوە بۆ ماڵە مێردی ئەوا مێردەکەی دەبێتە سەرپەشتیاری، ئەمەش مانای وایە دەبێت لە هەموو حاڵەتەکاندا نوقسان بمێنێتەوە.

هەولێ هەندێك کەسان بۆ داکۆکیکردن لەو دۆخە نالەبارەی کە یاسای ئەسینایی —و لەگەڵیشدا یاسای ئەفلاتونی ــ ژنی خستۆتە نێوییەوە و بڕواهێنان بەوەی یاسادانەرەکە مەبەستی ملکەچکردنی ژن بۆ سەرپەرشتی باوك یان مێرد یان نزیکترین خزمان نەبووە تەنیا بۆ پارێزگاری لێکردنی نەبێت»[١٨١] وتەیەکی ئێجگار لاوازە، چونکە هەر بە سادەیی بڵێین ئەوەی پێویستی بە پارێزگاری لێکردنە کەسی "پێنەگەیشتوو"ـە کە هێشتا گەشەی تەواوی نەکردووە و نەگەیشتۆتە تەمەنی پێگەیشتن تا خۆی بە تەنیا توانای هەڵسوکەوت یان توانای هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی هەڵسوکەوتەکانی خۆیی هەبێت. بە کورتی ئەو دەڵێت دەبێت ژن بەدرێژایی ژیانی بە پێنەگەیشتوویی بمێنێتەوە و هەمیشەش پێویستی بە سەرپەرشت هەبێ، ئەمە ئەو بۆچوونەیە کە ئەفلاتون بڕوای پێیەتی.

**٣- مارەیی:**

بابەتی "مارەیی" —یان دۆتەی ژنی ئەسینایی ــ بابەتێگی گرنگە، ئەم مارەییە لەگەڵیدا بۆ ماڵی خۆی و مێردەکەی دەگوازرایەوە، جا چ بەشێوەی "ئامێر" بووایە یان سامانی زەوی و زار. ئەو خۆی یان کەس و کارەکەی ئەم مارەییەیان دابین دەکرد و دەیبرد بۆ مێردەکەی، یەلاّم نەدەبووە موڵکی مێردەکەی بەڵکو پشتیوانێك بوو بۆ بەهێزکردنی پێگەی ژنەکە. هاوسەر بۆی هەبوو بەڕێوەبردنی موڵکەکانی ژنەکەی بگرێتە دەست و سوود لە زەوی و زارەکانی وەربگرێت و سامانەکانی بەکار بهێنێت. بە درێژایی ژیانی لەگەڵ مێردەکەی دەبوو، خۆ ئەگەر بەر لە مێردەکەی بمردایە ئەوا ئەو (ئەگەر لە ژنەکەی منداڵی هەبووایە) موڵك و ماڵەکەیی بەڕێوە دەبرد و تا مردن یان تا دووبارە هاوسەرگیریی دەکردەوە سوودی لێ وەردەگرتن. بەلاّم لە حاڵەتی مردنی مێرد یان تەلاّق یان هێنانی ژنی دووەمدا موڵکی و ماڵی ژنەکە یان مارەییەکەی بۆ منداڵەکانی دەگوازرانەوە، خۆ ئەگەر منداڵی نەبووایە ئەوا ماڵ و موڵکەکەی دەگەڕێنرایەوە بۆ سەرپەرشتەکەی. ئینجا مێرد بۆی نەبوو بیانفرۆشێت یان شتێکیان بخاتە ڕەهنەوە، لە هەندێك کاتیشدا دەبوو حسابی موڵك و ماڵەکەیی بۆ ڕوون بکاتەوە[١٨٢].

ئەدیبان ڕەخنەیان لە بیرۆکەی مارەیی گرانبەها گرتووە، بۆ نموونە "میدیا" لە شانۆی یۆربیدس-دا داد و بێ داد لە دەستی ئەو دۆتە گرانبەهایانە دەکات کە پێی دەدرێت «ئێمە کۆمەڵی ژنان بوونەوەرانێکین خاوەنی خراپترین بەخت، یەکەمجار داوامان لێ دەکەن مێرد بە سامانێکی زۆرو زەوەند بکڕین و بیانکەینە سەروەری جەستەمان، چونکە خراپترین بارودۆخ ئەوەیە مێردت نەبێت»[١٨٣]. بەلاّم ئەم مارەییە لە بنەڕەتدا ئامانجی پاراستنی ژنەکە بوو لە حەز و ئارەزووی مێرەدەکان چوون ڕێی تێدەچوو مێرد ژنەکەی خۆی تەلاّق بدات یان بە بێ هۆکار دەری بکات، خۆ ئەگەر "دۆتە"یەکی هەبێت کە پیاوەکە سوودی لێ وەربگرێت ئەوا ماوەیەکی دوورودرێژ لەم

کاره دوو دڵ ئەبێت، چونکە لەم بارودۆخەدا دەبێت دۆتەکە لەگەڵیدا بگەڕێنرێتەوە بۆ ماڵی باوکی یان سەرپەرشتەکەی.

ئەفلاتون —لە کتێبی پێنجەم ـــ ی "دیالۆگی یاساکان"دا مارەیی قەدەغە دەکات و دەیخاتە خانەی ئەو قەدەغانەوە کە نابێت لە دووەم دەوڵەتی فازڵدا بوونیان هەبێت چوون ئەمە وەکو قەرزێکە کە سووی بێ ئابڕوانەی بچیتە سەر، یاخود پێدانی سامان بە کەسێك کە جێی متمانە نییە، ئەو دەبێژێت: «دەبێت مرۆڤ لە سەروەختی تەواوکردنی ڕێوڕەسمی هاوسەرگیریدا هەرگیز مارەیی نەدات یان نەخاتە بەردەست»... (٧٤٢ ـــ بەرگی ٤ ـــ ل٣١١). پاشان لە کتێبی شەشەمی هەمان دیالۆگدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم بابەتە و دەڵێت پێشتر باسمان لە "دۆتە"ی هاوسەرگیریی کرد و قەدەغەمان کرد، تەفسیری هۆکارەکانی قەدەغەکردنی مارەیی ئەمەیە: «لەبەرئەوەی دەوڵەتەکەمان هاونیشتمانییەکانی خۆیی کردۆتە خاوەنی پێویستییەکانی ژیان. ئینجا (ئەگەر مارەیی قەدەغە بکرێت) هەڵبەت ژنانیش پۆز و لاف و گەزافیان کەمتر دەبێت و مێردەکانیش بەهۆی موڵك و سامانە تایبەتییەکانەوە نابنە کەسانێکی خاکەڕا و ئەڵقە لە گوێ» (٧٧٤حـ د ـــ بەرگی ٤ ـــ ص٣٤٢٢). بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت قەدەغەکردنی مارەیی لەلایەن ئەفلاتونەوە بۆ بارسووککردنی ژن یان لە کۆڵکردنەوەی "سەرپەرشت" نەبووە، بەڵکو لەبەرئەوەی پێی وابووە گواستنەوەی دۆتە بۆ ماڵە مێرد زەلیلکردنی پیاوە چونکە لەلایەکەوە ئیش بە "سامانی ژنەکەی"ـەوە دەکات، لەلایەکی دیکەیشەوە بەم سامانە دەبەسترێتەوە و دەبێت لەگەڵیدا بمێنێتەوە. لەبەر ئەمەش ژنەکە هەست بە پۆز و لوتبەرزیی دەکات و بەلاف و گەزافەوە مامەڵە لەگەڵ مێردەکەی دەکات.

### ٤- میرات:

لە یاسای یۆنانیدا کچ بۆی نەبوو ببێتە میراتگری باوکی، بەڵکو تەنیا منداڵە کوڕەکان بۆیان هەبوو میراتگر بن. ئەگەر کوڕەکان زۆر بوونایە باوکەکە یەکێکیانی بۆ

میراتگری لێ هەڵدەبژاردن، بەڵام ئەی لە حاڵەتی کچی هەتیودا چی ڕووی دەدا؟ مۆنیك پیتەر دەڵێت «حاڵەتێکی تایبەتی لە یاسای یۆنانیدا هەبوو، ئەویش حاڵەتی هەتیوکەوتنی کچی بێ برای میراتگر بوو، لەبەرئەوەی کچەکە خۆی نەیتوانیوە میراتگر بێت ئیدی دەرکی بەوە کردووە کە ناچارە لەگەڵ یەکێك لە خزمانی باوکیدا هاوسەرگیریی بکات تا میراتەکە لەنێو خێزانەکەدا بمێنێتەوە، خۆ ئەگەر ئەم خزمە خاوەنی ژن و ماڵ بووایە، ئەوا مافی خۆی بوو ژنەکەی تەڵاق بدات بە مەرجێك مێردێکی تری بۆ دۆزیبێتەوە. کەواتە دەتوانین مەزەندەی ئەوە بکەین ژن تا چ ڕادەیەك بە شت یان ئامراز دانراوە».. [١٨٤].

ئەم دۆخە نالەبارەی یاسای یۆنانی کە ئەفلاتون لە "یاساکان"ـیدا پارێزگاری لێ کردووە، بە درێژیی لە چەندین لاپەڕەدا بە وردی ڕێگاکانی میراتگریی دیاریکردووە کە لە هەموویاندا لە لایەنگرییەکی ئاشکرای پیاوان و هێشتنەوەی موڵکایەتی و نزمڕوانیی لە ژن دەرنەچووە، ئەو بەو وتەیەی دەست پێدەکات کە میراتگر ئەو کەسەیە باوك بە پێی ویستی خۆی دیاریی دەکات «سەرۆکی خێزان خولیا و ئارەزووەکانی خۆی دەخاتە نێو وەسیەتێکەوە کە یەکەمجار و پێش هەموو شتێك میراتگرەکەی تێدا دیاریکراوە، مەبەستم هەر کوڕێك لەو کوڕانەیەتی کە لەوانی تر باشترە ببێتە میراتگر». (٩٢٣ب ــ بەرگی ٤ ــ ل٤٩٤).

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین ئەفلاتون لەبارەی دەسەڵاتە بێ سنوورەکانی باوکەوە درێژە بە قسەکانی دەدات، ئەو خاوەنی زەوی و زارە، ئەو جێنشینەکەی خۆی دیاریی دەکات، ئەوەش دیاریی دەکات کێ ببێتە میراتگری و دەبێت ئەمانەش لە وەسیەتێکدا بنووسێت کە جێ بەجێکردنی واجب بێت و دەبێت میراتگرەکەیشی یەکێك لە کوڕەکانی بێت. «ئەگەر خاوەن وەسیەتەکە کوڕی نەبوو و تەنیا کچی هەبوو، ئەوا لەسەری پێویستە پیاوێك هەڵبژێرێت تا بە ئارەزووی خۆی یەکێك لە کچەکانی بکاتە ژنی و ئەویش بکاتە کوڕی خۆی و ئینجا میراتگری شەرعیی خۆی» (٩٢٤ ــ ل٤٩٥)، بەڵام «ئەگەر پیاوەکە مرد بێ ئەوەی هەرگیز وەسیەتی

نووسیبێت و خاوەنی منداڵی کوڕی وەهاش بێت کە پێویسیان بە چاودێریی پاسەوانەکان هەبێت، ئەوا هەمان ئەم یاسایانە دەیانپارێزن. خۆ ئەگەر بەهۆی ڕووداوەوە مرد و کچی لە دوای خۆی جێهێشت ئەوا دەبێت یاسادانەر کاروباری هاوسەرگیریی کچەکانی بەڕێوە ببات بە ڕەچاوکردنی لایەنی کەمی دوو مەرج لەم سێ مەرجە: خزمایەتی خوێنی، پاراستنی میراتەکە، خۆ ئەگەر یاسادانەرەکە مەرجی سێیەمی فەرامۆش کرد، ئەویش هەڵبژاردنی کوڕێکە لە نێو هاونیشتمانیان یان مێردێك بۆ کچەکەی، ئەوا باوك لێی خۆش دەبێت.. دەبێت برا باوکی و دایکی یان نا باوکی و دایکییەکانی ئەو باوکە ﴿واتە مامەی کچەکە﴾ کچەکە بدەن بە شوو، بەوەش بەشی پیاوە مردووەکە بەدەست دەهێنێت. خۆ ئەگەر مردووەکە برای نەبوو بەڵکو برازای هەبێت (لە ڕەگەزی کوڕ) ئەوا هەمان شت ڕوودەدات بە مەرجێك هەردووکیان (ئەو و کچەکە) لە تەمەنی گونجاوی هاوسەرگیریدا بن، خۆ ئەگەر برازایشی نەبوو بەڵکو خوشکەزای هەبوو (لە ڕەگەزی کوڕ) هەمان شت ڕوودەدات، هەر بەم جۆرەش هەتا خزمایەتی پلە چوار. خۆ ئەگەر برای باوکی بێت ﴿واتە مامی مردووەکە﴾ یان بگرە پلە پێنج کوڕی مامی مردووەکە یان پلە شەش کوڕی پوری مردووەکە هەر بەم جۆرەیە».. (٩٢٥ب ــ بەرگی ٤ ــ ل٤٩٦).

بەم شێوەیە ئەفلاتون لەم بابەتە دەکۆڵێتەوە و تا خزمانی پلە پێنج و شەش هەوڵی چارەکردنی دەدات، تا پیاوێك بدۆزێتەوە کچەکە هاوسەرگیریی لەگەڵدا بکات بۆ ئەوەی کچەکە مافی میراتگریی باوکی خۆی نەبێت. ئەی کەواتە ئەم یەکسانییەی نێوان پیاو ژن لەکوێی هزری ئەفلاتوندایە؟ ئەو ئەو وتانەی بۆ کوێ چوون کە دەڵێت «سروشتی ژن لە هیچ شتێکدا لە سروشتی پیاو جیاواز نییە تەنیا لەوەدا نەبێت لەڕووی جەستەییەوە لەوان لاوازترن؟.. یاخود وەك بارکەر دەڵێت ئەفلاتون "ئەم لایەنەی بابەتەکەی لەبیرکردووە"؟ ڕاستییەکەی مەسەلەکە لەبیرکردن و بیرکەوتنەوە نییە. بەڵکو وەك پێشتریش زیاد لە جارێك وتمان، پەیوەستە بە بەرەنجامێکی لۆژیکی کە لە هەڵوەشاندنەوەی موڵکایەتی تایبەتی و بزربوونی خێزان لە کۆمەڵگە

دەکەویتەوە، بەڵام ئەگەر موڵکایەتی بگەڕێتەوە و لەگەڵیشدا خێزان دەربکەویتەوە، ئەوا هەڵوێستی ڕاستەقینەی ئەفلاتون بەرامبەر پیاو و ژن هەر ئەمەیە کە باسکرا. ژن مافی هەڵبژاردنی هاوسەرگیریی نییە، بەڵکو سەرپەرشتەکەی ئەم کارە دەکات جا چ باوکی بێت یان باپیر یاخود نوێنەری ئەم دووانە، مافی لە میراتیشدا نییە تەنیا مەگەر هاوسەرگیریی لەگەڵ پیاوێکدا بکات. بەڵام تەنیا یەك حاڵەت هەیە کچ مافی هەڵبژاردنی هاوسەری هەیە ئەویش ئەگەر باوکی بمرێت» و نەتوانین خزمێك لەنێو خێزانەکەدا هەتا کوڕەزاکانی برای باوکە مردووەکە یان کوڕەزای کوڕەزاکانی براکەی بۆ کچەکە بدۆزینەوە، لەم دۆخەدا کچەکە دەتوانێت ئازاد بێت لە هەڵبژاردنی هەر هاونیشتمانییەك کە خۆی بیەوێت ببێتە ژنی ئەمەش بە ڕەزامەندی پاسەوانەکانی[١٨٥] و بەو مەرجەی بە یەکتر ڕازی بن و ئەگەر خۆی بیەوێت ئەکرێت مێردەکەی و زاواکەیشی ببنە میراتگری. (٩٥حـ ــ لا٤٩٦).

وێڕای ئەوەی ئەفلاتون بە تەواوی ئاگای لەو کێشانە بووە کە لە تەرخانکردنی میرات تەنیا بۆ نێرینەکان دەکەوێتەوە، کەچی بەرێگەی جیاواز هەوڵ دەدات بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانە بێ ئەوەی هەرگیز پەنا ببات بۆ مراتگرێتی ژن. ئەو دەڵێت: «کاتێك ژیان پڕیەتی لە ڕووداو ڕێی تێدەچێت پرسی دۆزینەوەی میراتگرێك بۆ میراتگریی میراتە جێماوەکە کارێکی زۆر ئەستەم بێت، لەبەر ئەمە ئەگەر کچەکە مێردێکی لەنێو سنووری شارەکەدا بۆ خۆی نەبینێتەوە ئەوا دەتوانێت لە دەرەوە بە دوایدا بگەڕێت، ئەگەر کەسێکیشی دۆزییەوە کە نێردرابێت بۆ یەکێك لە کۆلۆنییەکان و ئەو کەسەش یەکێك بێت لە خزمانی، ئەوا دەبێت لێی بچێتە پێش تا بە پێی ڕێکخستنی یاسا میراتییەکە وەربگرێت، خۆ ئەگەر خزمی نەبێت، و خزمیشی لەنێو شاردا نەبێت و کچی مردووەکەش هەڵی بژاردبێت و پاسەوانەکانیش ڕەزامەندییان لەسەر ئەم هاوسەرگیرییە نواندبێت، ئەوا پێویستە ئەم کەسە بگەڕێتەوە بۆ شارەکە تا جێیی ئەو مردووە بگرێتەوە کە بێ ئەوەی وەسیەتنامەی جێ هێشتبێت مردووە» (٩٢٥ ــ بەرگی ٤ ــ لا٤٩٦).

دواجار ئەی هەڵوێستی ئەفلاتون چییە لەبارەی بێوەپیاوان و بێوەژنان؟ دەتوانین سەرنجی ئەوە بدەین لەو بارەیشدا هەر فەرق و فروقیان دەکات «ئەگەر ژنەکە مردوو و منداڵی لەدوای خۆی جێهێشت، کوڕ بن یان کچ ئەوا یاسا ڕێنمایی مێردەکەی دەکات ـــبێ ئەوەی ناچاری بکات ـــ منداڵەکانی پەروەردە بکات تا نەچنە نێو ماڵی باوکی ژنەکە.. بەڵام ئەگەر منداڵی نەبوو ئەوا یاسا ناچاری دەکات دووبارە هاوسەرگیریی بکاتەوە، تا ژمارەیەکی پێویست منداڵ بۆ خێزانەکەی و دەوڵەت بخاتەوە». ئەمە بەنیسبەت بە پیاو.. «بەڵام ئەگەر مێردەکە مردوو و لەپاش خۆیەوە کۆشێك منداڵی جێ هێشت ئەوا ژنەکە بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانی وەك سەرپەرشتیاری ماڵ دەمێنێتەوە. بەڵام ئەگەر بینی زۆر لەوە بچووکترە کە بە بێ مێرد وەك ژنێکی "خاوەن فەزیلەت" بژی، ئەوا پێویستە خزمەکانی پەیوەندی بە ژنانی سەرپەرشتیاری هاوسەرگیریی بکەن تا ﴿خزمان و سەرپەرشیارانی هاوسەرگیریی﴾ لەگەڵ یەکتردا کۆببنەوە بۆئەوەی بڕیار لەسەر ئەوە بدەن کە بۆ ئەم بارودۆخەی پێیان باشە، خۆ ئەگەر ژمارەی منداڵەکان کەم بوون ئەوا ڕەچاوی ئەم کەمی و زۆرییە دەکەن» (٩٣٠حـ ـــ بەرگی٤).

ماوەتەوە باس لەوە بکەین هەندێك لە توێژەران وای دەبینن ئەو جیاوازییە سەرسوڕهێنەرەی لەنێوان "کۆمار" و "یاساکان"دا هەیە ناگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەفلاتون بۆچوونەکانی خۆیی گۆڕیوە، یان دەستکاری هەڵوێستی خۆیی بەرامبەر سروشت و توانای ژن کردووە، بەڵکو جیاوازییەکە لە دۆخی موڵکایەتی تایبەتی لە هەردوو شارە نموونەییەکەدایە، لە شاری یەکەمیاندا موڵکایەتی بوونی نییە بۆیە خێزانیش بزرە، بەڵام شاری دووەم لە دیالۆگی "یاساکان"دا موڵکایەتی و خێزانیش هەردووکیان دەگەڕێنەوە، بۆیە ڕۆڵی تەقلیدییانەی ژنیش دەگەڕێتەوە، لە هەردوو حاڵەتەکەیشدا ئەفلاتون یەك جیهانبینی بەرامبەر ژن هەیە ئەویش ئەوەیە "ژن موڵکی تایبەتیی پیاوە"، ئەگەر ئەم موڵکایەتییە هەڵبوەشێتەوە ئەوا لە موڵکایەتی

ڕزگاری دەبێت و دەبێتە پیاو چونکە بێ ڕۆڵ و وەزیفە دەکەوێت. بەڵام ئەگەر موڵکایەتی بگەڕێتەوە ئەوا دووبارە پیاو دەتوانێت ژن بکاتەوە بە موڵکی خۆی.

«بەم جۆرە ئەفلاتون پێی وابووە ژن موڵکی تایبەتە و سەر بە موڵکەکانی پیاوە، کاتێك خێزان دیار و ئاشکرایە ئەویش وەزیفەکەی دەردەکەوێت و ئەفلاتون بەهۆی بونیادی کۆمەڵایەتی و ئابووریی کۆمەڵگە نوێیەکەوە نەیتوانیوە سەرنج لە ڕۆڵی "ژنی شۆڕشگێڕ" بدات کە وا دەردەکەوێت بەرهەمێکی لۆژیکی ئەم جۆرە بیروباوەڕانەیە. لە وەها کۆمەڵگەیەکی نوێدا پێویستە سروشتی ژن لە سروشتی پیاو جیاواز بێت، دەبێت ژن پاك و بێ گەرد و بەڕێز و بە ئەدەب بێت تا شیاوی ئەوە بێت ببێتە ژنێکی دڵسۆز و شەرعیەتی میراتگری ئەو میراتییە وەربگرێت کە ئەم موڵك وماڵەی بۆ جێ دەهێڵێت. بەڵام پیاو دەبێت سیفەتی خانەدانی و شەهامەت لەخۆیدا دەربخات کە ئەم سیفەتانەش لە سیفەتەکانی پاسەوانی ئایدیالی زێدەڕۆتریشن»..[186].

# بەشی سێیەم

## ئەوینی ئەفلاتونی و ژن

### یەکەم: هاوڕەگەزبازیی

وەك بینیمان ژیانی ژن لە کۆمەڵگەی ئەسینناییدا ژیانێکی "تایبەتی نهێنی" بوو، دەبوو بە بێ دەنگی و شاراوەیی بمێنێتەوە و وەك توکیدیدز دەڵێت لە نێو ماڵدا ناو و جەستەی خانمەکە دەپارێزرا[187]. لەلام شورەیی بوو بۆ پیاو لە ماڵ بمێنێتەوە. وەك زینەفۆنیش دەڵێت دەبوو ژیانی لە دەرەوەی ماڵ بباتە سەر، لە بازاڕەکان و فەزای گشتی و سیاسەت و کۆڕو کۆبوونەوەکاندا...هتد[188]. لەم ژیانەیشدا تەنیا لەگەڵ پیاوانی وەك خۆیدا بوو کە بە هاوڕێیەتی و خۆشەویستییەوە بەیەکەوە پەیوەست بوون، ئەم پەیوەندییەش زۆرجار دەگۆڕا بۆ پەیوەندی سێکسی. بەم جۆرە لە کۆمەڵگەی ئەسینناییدا پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان هاوڕەگەزبازی و گۆشەگیرکردنی ژن لە "سوچێکی حەرەمسەراکاندا هەبوو.. ژن لەوە کەمتر بوو ببێتە هاوکوف و هاوڕێی چونکە لەڕووی تەمەنەوە بە "منداڵ"ـی ئەو دەژمێردرا ـــ هەروەها لە ژیانی سیاسی و فەرهەنگیشدا هیچ بایەخێکی پێ نەدەدرا. ئینجا تەنیا ئامرازێك بوو بۆ نەوەخستنەوە، ژن "حەشاردراو"ـێکی فەرامۆشکراوی بێ بەها بوو.. ئەمەش تەنیا لەژێر ڕۆشنایی هاوڕەگەزبازیدا ڕوون دەبێتەوە، کە لای ئەوان باو بووە. «زۆرترین کێبەکێکارانی سۆزانییەکان نۆکەرە لوسکەلەکانی ئەسینا بوون، سۆزانییەکانی ئەسینا نارەزاییان بەرامبەر ئەو داڕزانە ئاکارییە قێزەونە دەردەبڕی کە لە حەزی نێر بۆ نێردا هەبوو»[189]. بازرگانەکان نۆکەرە لوسکەکانیان دەهێنا و بەو کەسانەیان دە فرۆشتن کە زۆرترین نرخیان پێ دەدان.

یەکەمجار ئەمانە خۆیانیان پێ دادەمرکاندنەوە و ئینجا ئەو کەسانەی لە پێگەی بەرزتردا بوون وەریان دەگرتن.. لە ئەسینادا کەسێك نەبوو پێی وابێت عەیبێك لەوەدا بێت کە لاوەکان شەهوەتی پیرەکانی شارەکە بخرۆشێنن و ئەم شەهوەتە تێر بکەن. ئەم مومارەسە (شازە) تەنیا لە ئەسینادا نەبوو، بەڵکو لە زۆربەی شارە یۆنانییەکاندا بڵاوبووبوویەوە، ئەم کارە لە سپارتەشدا هەبوو —ئەمە یەکێك بوو لەو لایەنە خراپانەی ئەفلاتون لە خوانە هاوبەشەکانیاندا دەیبینی (یاساکان ٦٣٦ ب)، ئەرستۆ پاساوێکی زۆر سەیر بۆ ئەم دیاردەیە لە کریت دەهێنێتەوە «یاسادانەری کریتی پیاوان و ژنانی لە یەکتر جیا کردۆتەوە بۆ ئەوەی ڕێژەی لەدایکبوون کەم بکاتەوە، لە بەر هەمان هۆکاریش هاوڕەگەزبازیی لەنێو نێرەکاندا بە ڕەوا بینیووە».. [١٩٠]. بەم جۆرە ئەرستۆ پاساوی دیاردەی شازیی سێکسی بە ترس لە قەرەباڵغی دانیشتوان لە شاردا، دەداتەوە.

هەروەها سەیرە سەرکردەیەکی وەك "زینەفۆن" کە بە یەکێك لە ڕەقترین و کەللەڕەقترین پیاوانی جیهان ناسراوە شانازی بەوە دەکات کە کەوتۆتە داوی خۆشەویستی کلیناسی لاوەوە! هەروەها پیاوانێکی گەورەی یۆنانییش هەبوون گوزاشتیان لە ڕێزی خۆیان بۆ ئەم شێوازە پەیوەندییە سێکسییە کردووە وەك یۆربیدس و سۆلۆن[١٩١]. بەڵام بڵاوبوونەوەی ئەم دیاردەیە وەك ئەرستۆ دەیگوت ناگەڕێتەوە بۆ سنووردارکردنی ڕێژەی "لەدایکبوون"، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ غیابی ژن و گۆشەگیرکردنی لە سوچێکی تاریکی ماڵدا، ئەمەش وای کردووە کۆمەڵگە لە جەوهەری خۆیدا ببێتە کۆمەڵگەیەکی نێرینەیی و پیاوێك نەبووە ژنێکی بەڕێز بناسێت جگە لە ژنەکەی خۆی و کچەکانی، پەیوەندیشی پێیانەوە بە جۆرێك نەبووە کە لەڕووی عاتیفی و روحییەوە تێرییان بکات، بۆ نموونە "زینەفۆن" بۆمانی دەگێڕێتەوە ژنەکەی لە بیست و پێنجساڵیدا بوو کاتێك هاوسەرگیریی لەگەڵ کرد[١٩٢]. کەچی کەسانێك هەبوون هاوسەرگیریان لەگەڵ کچی وادا کردووە کە لەو تەمەنە کەمتر بوون، واتە تەنیا "منداڵ"ـێك بوون و هێشتا پێنەگەیشتوون، لەبەرئەمە

شتێکی سروشتییە پیاو لە دەرەوەی ماڵ بەدوای پەیوەندییەکی عاتیفی پێگەیشتوودا بگەڕێت و خۆیی پێ پڕ بکاتەوە، ئەمە وێڕای ژیانی سەربازیی و بێ بەشکردنی لە کاری سێکسی و شەیدابوونی جەستە ڕووتەکانی نێو یارییەکان و وەڵامدانەوەی خرۆشان و وروژانی غەریزەکانی[١٩٣].

## دووەم: ئەفلاتون و هاوڕەگەزبازیی

ئەفلاتون هێرشی کردۆتە سەر هاوڕەگەزبازیی و سەرکۆنەی کردووە و لە بەهای کەم کردۆتەوە و بگرە لە "دیالۆگی یاساکان"ـدا قەدەغەی کردووە. بەڵام ئەوەی سەیرە سەرکۆنەی هاوڕەگەزبازیی وەك خۆی نەکردووە، مەبەستم ئەوەیە ئەم هێرشەی بۆ سەر ئەم جۆرە شازبوونە لە مومارەسەی سێکسیدا لە بەر بەرژەوەندی "ژن" یان لەبەرژەوەندی ڕەگەزەکەی تر نەبووە —کە لە ڕاستیدا هەق بوو وا بێت ــ بەڵکو ئەفلاتون لە ڕاستیدا ڕقی لە هەموو جۆرە پەیوەندییەکی سێکسی بووە.

بەڵام بۆچوونی ئەفلاتون لە "شازی سێکسیدا" هەر لە سەرەتاوە ڕقلێبوونەوە و ڕەتکردنەوە نەبووە، بەزۆریی ئەو لەم پەیوەندییەدا شوورەییەکی نەدەبینی، یان لایەنی کەم بە لێبووردەییەوە لێی ڕوانیوە، لەم بارەیەوە سێ نموونە دێنینەوە.

١- لە دیالۆگی چارمیدس CHARMIDES دا کە لە بارەی داوێنپاکییەوەیە، دەبینین سوکرات لە جەنگ هاتۆتەوە، لەبارەی ئەوەوە پرسیار لە هاوڕێکانی دەکات کە ئێستا چ "گەنجێك" لە هەموویان جوانترە، ئەوانیش دەڵێن "چارمیدس"ی گەنج جوانترینە. لەگەڵ ئەوەی سوکرات بەخۆی دەڵێت بڕوای بە جوانی هەموو گەنجان هەیە «زۆرینەی گەنجانی منداڵکار لە چاوی مندا جوانن».. (١٥٤جـ ــ بەرگی١ ــ ل٨٧)، کەچی کاتێك چاوی بە "چارمیدس" دەکەوێت ئەبڵەق دەبێت و دەڵێت «شاهیدی ئەدەم من کەوتوومەتە داوی جوانی و لەش و لاری ئەم گەنجەوە». هەروەها سەرجەم هاوڕێکانیشی شەیدای بوون، ئەفلاتون دەگێڕێتەوە گەنجەکە خۆی کرد بە هۆڵێکدا و یەك پۆلە پیاویش لە ئەویندارانی بەدوایەوە بوون، شیریفۆن

CHAERECHON لەبارەی ڕوخساری ئەم گەونجەوە پرسیار لە سوکرات دەکات «سوکرات ڕات چییە لەبارەی ڕوخساری ئەم گەنجەوە؟ قەشەنگ نییە»؟ سوکراتیش وەڵامی دایەوە «لە قەشەنگ زیاتر»!، شریفۆنیش دەڵێت «بەڵام ئەگەر جەستەی بە ڕووتی ببینیت ئەڵێیت ڕوخساری هەر هیچ نییە، ئەو لە هەموو ڕوویەکەوە تەواوی سیفەتەکانی تێدایە» هەمووان ئەم قسەیان پەسەند کرد (١٥٤ حـ ـــ بەرگی ١ ـــ لا٨٧). ئەفلاتون لەم دیالۆگەدا هیچ لەکەیەك نابینێت لە ئەوینی نۆکەرەکاندا، "گرۆپ" وای دەبینێت «ئەگەر بێتوو بەم جۆرە لە هەڵوێستی سوکرات لەبارەی جوانی نێرینە و بەتایبەتیش گەنجان تێنەگەین ئەوا لە ئەفسوونی دەم و لەفزی و بۆ شەیدابوونەکانی تێناگەین»[١٩٤].

٢- لە دیالۆگی "لیسس LYSIS دا دەبینین هیپۆتالیس HIPPOTHALES سوکرات بانگهێشت دەکات بۆ سەردانکردنی مەیدانی زۆرانبازیی کە تازە دامەزراوە و هاوڕێیان لەوێ بوون. کاتێك سوکرات لەبارەی ئەوەی کێ لەم هاوڕێیانە بە"باشتر" دەزانێت پرسیاری لێ دەکات ئەو «ڕووی سوور هەڵگەڕا و سەرکولمەکانی داگیرسان». ئیدی سوکرات زانی و بە لاقرتێیەوە توانجی ئەوەی لێدا کە ئەو گەنجە لە خۆشەویستیدایە «پێویستم بەوە نییە پێم بڵێیت تۆ لە حاڵەتی خۆشەویستیدایت چوون دانپێدانانەکەت درەنگ کەوت، ئاشکرایە تۆ تەنیا لە حاڵەتی خۆشەویستیدا نیت بەڵکو هەتا بناگوێت نوقمی خۆشەویستییە.. وێڕای ئەوەی من هیچ ئەزموونێکم لە بوارەکانی دیکەدا نییە، وەلێ خوداکان ئەو بەهرەیەیان پێداوم کە بتوانم بزانم ئەویندار و یارەکەی بناسمەوە» (٢٠٤جـ ـــ بەرگی ١ ـــ لا٤٢). جا کاتێك گەنجەکە دەبینێت سوکرات ئافەرینی ئەو سەلیقە بەرزە لە "هیپۆتالیس" دەکات ڕوخساری زیاتر و زیاتر سوور دەبێتەوە و دادەگیرسێت. ئینجا لەبارەی ئەوەوە پرس و باسی لەگەڵدا ئەکات کە لەم بارودۆخانەدا پێویستە ئەویندار چی بڵێت.. بۆیە کورتەی ئەزموونەکانی خۆیی پێ دەدات: حەکیمی ئەویندار بەر لەوەی لەگەڵ یارەکەی بکەوێتە دەستبازی ستایشی ناکات.. چونکە گەنجی جوان کاتێك یەکێك لە

ئەویندارەکانی ستایشی دەکەن لەخۆی بایی دەبێت» (٢٠٦أ ــ بەرگی ١ ــ لا٤٤٤)، بۆیە سوکرات ئامادەی دەکات بۆ ئەوەی ڕێگای دروستی فێر بکات. بەڵام ئەگەر وەك ڕێگەیەکی سوکراتی بۆ "ڕاوکردن"ــی گەنجان برێك قەشمەرجاڕیی کردبێت ئەوا هەڵبەت لە ڕێگای هیپۆتالیس جیاواز دەبوو، یەکەم ئەمە ڕوون نابێتەوە تەنیا لە کۆتایی دیالۆگەکەدا نەبێت، دووم لێرەدا بۆمان گرنگە ئەوە دەربخەین خۆشەویستی گەنجان بۆ یەکتر بە درێژایی دیالۆگەکە شتێکی زۆر ئاساییە و شایەنی سەرزەنشت و لۆمەکردن نییە! وێڕای ئەوەی لێرەدا بابەتی خۆشەویستی نۆکەرەکانن لە تەمەنی قوتابخانەدا (٢٠٨ جـ)، ئەوانەی تەمەنیان لە شازدە ساڵ تێناپەڕێت[١٩٥].

٣- دوای هەموو ئەمانە کەسایەتییەکی بەناوبانگ هەیە "قبیادس" ــ پاسەوانی پێرکلیس و ناسك و نازدارەکەی ئەسینا ــ کە شانازی بەوە کردووە پیاوانێکی زۆری ئەویندارى هەن! ئەفلاتون لە دیالۆگی یاساکاندا بۆمان دەگێڕێتەوە کە قبیادس چۆن هەوڵێکی بێ وچانی تا ڕادەی گریان داوە تا سوکرات بخاتە نێو داوەکەوە «سوکرات بە ڕادەیەك کاری تێ کردووم کە باسکردنی درێژە.. هەرکات گوێم لێی بێت لێدانی دڵم خێراتر دەبێت و دەکەوێتە لەرزین.. وەك ئەوەی لە مەستییەکی سۆفییانەدا بم، فرمێسك لە دیدەمەوە هەڵدەقولێت و سەرنج دەدەم ئەوەی بەسەر مندا دێت بەسەر کەسانی تریشدا دێت» (خوان ٢١٥أ ــ بەرگی ١ ــ لا٥٤٧). «من متمانەم بە سەرنج ڕاکێشیی گەنجیی خۆم هەیە» و سوکراتیش بە ڕاستی سەرسامە بە گەنجی و جوانی من و هەر کە دەزانێت خەریکە بە مەرامەکەی خۆی بگات ئیدی لە خۆیەوە «تووشی نائومێدی دەبێت و ئینجا جارێکی تریش بازنەکە دەست پێدەکاتەوە».. بەردەست و خزمەتکارەکانی خۆم ڕەوان کردن تا بەتەنیا لەگەڵی بمێنمەوە.. بەو خەیاڵەی کە پێم وابوو بەتەنیا لەگەڵم بمێنێتەوە ئیدی ئەو ئیشە ئەکەین کە دوو خۆشەویست لەگەڵ تر دەیکەن، بەمە دڵخۆش دەبووم.. بەڵام سوکرات شتی وای نەکرد».. (٢١٧ب ــ بەرگی ١ ــ لا٥٤٩). جاری سێیەم «بانگهێشتم کرد بۆ ئەوەی نانی شێوانم لەگەڵ بخوات، وا هەڵسوکەوتم لەگەڵ کرد کە

هەر یارێك بۆ یاوەرەکەی دەیکات تا ئیشەکە پێك بێت.. هەتا درەنگانی شەو هێشتمەوە.. مکوڕبووم لەسەر مانەوەی لەماڵەکەم بەو بیانووەی کات درەنگی شەوە، شەوی بە ڕاکشاویی لەنێو پێخەفەکەم بردەسەر، کەسیشمان لەگەڵ نەبوو. زۆرم لە خۆم کرد کە ئەم جارەیان پارێز نەنوێنم، بەڵکو ڕاشکاوانە هەستی خۆمی بۆ دەربڕم، شانێکم پێدا کێشا و وتم: سوکرات تۆ خەوتوویت؟.. هتد (خوان ٢١٨د ج ــ بەرگی ١ ــ لا٥٥٠). گرۆپ دەڵێت «قبیادس لە دیالۆگی خواندا لەبارەی ئەوەوە قسەمان بۆ دەکات کە ویستوویەتی سوکرات لە خشتە ببات، بەڵام شکستی هێناوە، چیرۆکەکە ناوەڕۆکە ڕاستەقینەکەی خۆی لەدەست دەدات ئەگەر ڕەتمان کردەوە قەبووڵی ئەوە بکەین سوکرات لەخشتەبراوە، خۆ ئەوەی لە دیالۆگەکەدا ستایش دەکرێت توانای ئەو بووە بۆ خۆکۆنترۆڵکردن، نەك ڕەتکردنەوەی و قەبووڵ نەکردنی».. [١٩٦].

ڕاستییەکەی ئێمە لە دیالۆگی "پروتاگوراس"ــدا بە ڕوونی هەست بەم پەیوەندییەی نێوان سوکرات و قبیادس دەکەین، بۆیە ئەوەندە بەسە ئەم کۆدەی خوارەوە بهێنینەوە:

« ــ تۆ لە کوێوە هاتی ئەی سوکرات؟ من دەزانم تۆ دوای قبیادسی قۆز کەوتبوویت، دوێنێ بینیم وەك پیاوان ڕیشی هاتووە و ئەو ئێستە بە ڕاستی پیاوێکە بۆ خۆی، ئەمەش ئەو شتەیە کە من ئەمەوێ بۆتی بدرکێنم، بەڵام پێم وایە هێشتا سەرنج ڕاکێشە»... سوکرات وەڵام دەداتەوە: «جا چی تێدایە گەر ڕیشیشی هاتبێت؟ ئەی تۆ نەتدیوە هۆمیرۆس دەڵێت: گەنج ئەو کاتە ئەفسوونی زیاترە کە بۆ یەکەمجار ڕیشی دەردێت؟ ئێستا کاتی ئەفسونی قبیادسە».. (پروتاگوراس ٣٠٩أ-ب بەرگی ١، لا١٣٣).

بەڵام ئەفلاتون لەگەڵ بەسەرەوەچوونی تەمەنیدا هەنگاو بە هەنگاو دەستکاری لە بۆچوونی خۆیدا کردووە و لە دیالۆگی "کۆمار"دا داوای ئەوەی کردووە سنوورێك بۆ ئەم لادانە دابنرێت و ڕێسایەك دابنرێت کە دەبێت لەسەر ئەو بنەمایە یاوەرەکە

یارەکەی ماچ بکات و لێی نزیك ببێتەوە و دەستی بۆ بەرێت، وەك ئەوەی کوڕی خۆی بێت و لەمەشدا چاوی بڕیبێك لە ئامانجێکی شەرەفمەندانە.. (٤٠٣ب ــ بەرگی ٢ ــ لا٢١٥). ئەگەر چی ئەو لە کتێبی پێنجەمدا ڕێ بە جەنگاوەرە نەبەردەکان دەدات —لە پاداشتی نەبەردییەکەیاندا ــ «عاشقی گەنجە هاوڕێکانیانیان بن کە بە پێی یاسا دەبێت ئەوانیش بە درێژایی جەنگ قەبوولّی ئەم هەست گۆڕینەوەیە بکەن.. لە کاتی شەڕیشدا هەرکەسێکی لەگەڵدا بێت نابێت ماچیان لێ قەدەغە بکات. بەمەش ئەوە مسۆگەر دەکەین کە ئەگەر یەکێك لە جەنگاوەران بکەوێتە ئەوینی گەنجێك یان کچێکەوە ئەوا پەرۆشییەکەی بۆ سەرکەوتن زیاتر دەبێت».. (کۆمار ٦٤٨جـ ــ لا٣٢٧). بەڵام سوکرات ئاگادارمان دەکاتەوە لەوەی ئەم هەست گۆڕینەوانە نابێت بگاتە ئەودیوی خۆشەویستییەکی سادەی بێ گەرد جا هێز و گوڕی هەرچەندێکیش بێت!.

خۆ ئەگەر بەرەو قۆناغی کۆتایی ڕابگوزەرێین ئەوا دەبینین ئەفلاتون لە دیالۆگی "یاساکان"دا هێرشێکی زۆر توند دەکاتە سەر هاوڕەگەزبازیی و بە «خۆشەویستی نا سروشتی» وەسفی دەکات «مەبەستیشم ئەوەیە خۆشەویستی لەنێوان گەنجانی یەك ڕەگەزدا: خۆشەویستی پیاو بۆ پیاو و ژن بۆ ژن.. بەرەنجامی ئەم خۆشەویستییە زۆر مەترسیدارە لەسەر تاکەکان و شارەکە» .. (یاساکان ٨٣٦ ــ بەرگی ٤ ــ لا٤٠٢). بۆیە بەدوای ڕێگەیەکدا دەگەڕێت ئەم مەترسییە پڕ هەڕەشەیەمان لێ دوور بخاتەوە «دەگێڕنەوە هیچ ئومێدێك نییە بۆ چارەسەرکردنی ئەم هەڵوێستە لە کریت و سپارتەدا، چونکە هەردووکیان پێکەوە ڕێیان بەم پەیوەندییە داوە. ئەو وایدەبینێت پێویستە دیسان ئەو یاسایە بهێنینەوە کایە کە لە سەردەمی لایۆس LAIUS ـدا هەبووە[١٩٧].. ئەو پێی وایە هەڵەیە نێرینە شەهوەتی خۆی بەو شێوەیەی لەگەڵ ئافرەتدا تێری دەکات لەگەڵ نێرینەیەکی تردا تێری بکات.. ئێمە دەبێت سەرنج لە غەریزەی ئاژەڵان بدەین و لێیانەوە فێر بین کە هەرگیز نێر لە نێر نزیك نابێتەوە، چونکە ئەم ڕەفتارە دژی سروشتە.. کێ لە ئێمە سەرزەنشی ئەونێرەمووکە ناکات کە

خۆی داوە بەدەست شەهوەتەکانییەوە و توانای ئەوەی نییە بەسەریاندا باڵادەست بێت «ئایا هەموو خەڵکی سەرزەنیشتی ئەم ڕەفتارە ژنانەیە ناکەن؟ (ئەو لایەنەی ڕۆڵی ژن دەبینێت) چونکە لاسایی ژن دەکاتەوە.. » (یاساکان ٨٣٦أ ــ بەرگی٤ ــ ل٤٠٢-٤٠٣). ئەفلاتون لە دیالۆگی "فایدرۆس"ـدا وا وەسفی ئەو کەسانە دەکات کە مومارەسەی هاوڕەگەزبازیی دەکەن «کاریگەری چێژ دەبێتە پاڵنەری، ڕەفتارێکی گەمژانە ئەنجام دەدات، ئیدی نە دەترسێت و نە شەرم دایدەگرێت لە زێدەڕەویکردن لە تێرکردنی چێژی دژە سروشت».. (فایدرۆس ٢٥١أ ــ بەرگی ٣ ــ ل١٥٧).

## سێیەم: ئەوینی ئەفلاتونی و ژن

وتمان هێرشی ئەفلاتون بۆ سەر هاوڕەگەزبازیی و لەقەڵەمدانی بە لادان "دژی سروشت" بە ناچاری واتای ئەوە نییە کە ئەو پەیوەندی سێکسی ئەگەڕێنێتەوە بۆ دۆخە "سروشتی"ـیەکەی لەنێوان پیاو و ژندا، بەڵکو جێی سەرنجە ئەفلاتون باسی لە هەرجۆرە پەیوەندییەکی سێکسی کردبێت هەمیشە بە بڕێکی زۆر ڕق و کینەوە لێی ڕوانیوە، تەنانەت دۆخی سروشتی پەیوەندی سێکسی "نێوان پیاو و ژن"ـیش دەبێت لە بەرتەسکترین سنووردا بێت و بە مەبەستی وەچەخستنەوە بێت! ئەمەش لەگەڵ بیروبۆچوونە گشتییە میتافیزیکییەکەیدا دەگونجێت کە جەستە و چێژەکانی و شەهوەتەکانی سەرکوت دەکات.. ئێمە وەك هەندێك لە توێژەران بۆی دەچن ئاواتی ئەوەمان هەبوو خۆشەویستی ئەفلاتونی کە "ناوبانگەکەی بە هەموو لایەکدا بڵاوبۆتەوە"، ببێتە: "ناونیشان"ـی جۆرێکی تایبەت لە ئەوینی نێوان پیاو و ژن، کە تێیدا خۆیان لە پەیوەندی جەستەیی دابماڵن و بەرەو پەیوەندییەکی ڕوحی ئەبستراکت باڵابن و ئەمەش "ببێتە" خۆشەویستییەکی بە گوڕوتین و ئارەزوومەندییەکی پاکیزانە و هەڵکشان بەرەو باڵا..هتد[198]. ئیدی لەم جۆرە وەسفە جوانانە. من دەڵێم من ئومێدی ئەوەم دەخواست ئەوینی ئەفلاتونی نێوان پیاو و ژن، بگرە بە چاوپۆشی لە پەیوەندی سێکسی نێوانیشیان، بەم جۆرە بەرز و باڵا ببوایە، بەڵام بەداخەوە ئەو

خۆشەویستییە بەبالآبردنی "هاوڕەگەزبازیی.. و بەرزکردنەوەی نێربازیی" بوو. جۆرج سارتۆن دەڵێت: «کاتێك بیر لە خۆشەویستی دەکەینەوە هاوڕێیەتییەکی ڕوحی بە مێشکماندا دێت کە لە نێوان پیاو و ژندا بەر قەرار دەبێت، وەلیّ ئەفلاتون بیری لە دروستکردنی پەیوەندیی ڕوحی نێوان پیاوان و لاوان کردۆتەوە، ئەوینی ئەفلاتونی لای ئەفلاتون بەرزکردنەوەی نێربازییە، وەك لە خوانیشدا دەڵێت خۆشەویستی ڕاستەقینە ڕێگەیەکی دروستە بۆ خۆشەویستی نۆکەر»..[١٩٩].

جێی سەرسوڕمانە بە درێژایی دوو دیالۆگ کە بۆ خۆشەویستی تەرخان کراوە ئەوانیش "خوان" و "فایدرۆس"ـن ئەفلاتوون پێی وایە خۆشویستنی ژن کارێکی قێزەون و شایەنی نکوڵیلێکردنە! هیچ کەس بە سوکراتیشەوە بەرپەرچی ئەو ڕاڤانە نادەنەوە کە پۆزانیاس PAUSANIAS و ئەرستۆڤان بۆ خۆشەویستی دەیکەن، ئەم دووانە بە توونددی خەونیان بە سێکسی جیا ڕەگەزییەوە دەبینی، یان دۆخی سروشتی پەیوەندی سێکسی نێوان پیاو و ژن، پۆزانیاس خۆشەویستی بۆ دووجۆر دابەش دەکات لەبەرئەوەی دوو خواژن هەن کە ناوی "ئەفرۆدێت"ـیان هەڵگرتووە ـــ خۆشەویستییەك هەیە تایبەت بە ئەفرۆدێتی ئاسمانیی کچی ئۆرانۆس "ئاسمان" کە دایکی نییە و خۆی خوشکە گەورەیە. ئینجا ئەفرۆدێتی گچکە هەیە کچی دیۆن DIONE ـە لە زیۆس ئەمیش ئەفرۆدێتی عەوامە «گومان لەوەدا نییە خۆشەویستی ڕسوا و نزم دەدرێتە پاڵ ئەفرۆدێتی عەوام.. ئەوە خۆشەویستییەکە کە دڵی خەڵکانی نزم و عەوام ئاوەدان دەکاتەوە، خەسڵەتیشی ئەوەیە لە ژنان و غەلامەکان دەکات، ئاراستەی جەستە دەکرێت نەك ڕوح، ئەم جۆرەیان خۆشەویستییەکی هەستەکییە نەك ڕوحی، هەروەها دەبینین کار لەوە دەکات کە یارەکەی لەڕووی عەقڵییەوە لاوازترە چونکە هەوڵ دەدات بۆ تێرکردنی شەهوەتە گەمژانەکانی و ئیدی بۆی گرنگ نییە چۆن تێری دەکات».. (خوان ١٨١أ ـــ بەرگی ١ ـــ ل٥١٢).

پێویستە سەرنجی ئەوە بدەین لەم دەقەدا ئەفلاتون پەیوەندی سێکسی بە ژنەوە — کە دەبوو ئەمە حاڵەتە سروشتییەکە بووایە ــ لەگەڵ پەیوەندی سێکسی بە نێرینەوە —پێشتر ئەم دۆخەی بە "دژە سروشت" پەسن دابوو ــ یەك دەخات، بەڵام ئەو لێرەدا ئامانجی هێرشکردنە سەر هاوڕەگەزبازیی نییە، بەڵکو پەلاماری هەموو جۆرە مومارەسەیەکی سێکسی دەدات!.

هەروەها جێی سەرنجە ئەفرۆدێتی عەوام کە لە ئەفرۆدێتی ئاسمان بچووکترە، چاودێرە بەسەر ئەم جۆرە خۆشەویستییەوە ــ لەبەر ئەمە ئێمە هەست بە هەڵەشەیی و گێلێتی گەنجانە دەکەین، ئەفرۆدێتی گچکە «لەڕێگەی پەیوەندییەکی سێکسییانەی پەتیی نێوان نێرینە لەگەڵ مێینە هاتۆتە بوون.. بەڵام ئەفرۆدێتی ئاسمانی کە خاوەنی جۆرە ناوازەکەی خۆشەویستییە باسێك لە مێینەی تێدا نییە، بەڵکو تەنیا لە نێرینەوە هاتووە، هەروەها ئەمیان لەڕووی تەمەنەوە گەورەتریشە، واتە بێ بەرییە لە هەڵەشەیی و چرپنی گەنجانە. هەر کەس خۆشەویستی ئاسمانی دڵی ئاوەدان بکاتەوە ئەوا مەیلی بۆ نێرە نەك مێ، نێرینە بە سروشتی خۆی بەهێزتر و باڵاترە» (خوان ۱۸۱ جـ ــ بەرگی ۱ ــ ل۵۱۳).

لەم دەقەدا ڕقی ئەفلاتون لە هەر پەیوەندییەکی سێکسی ڕوون و ئاشکرایە. جا بۆیە هێرشەکەی پێشتری بۆ سەر هاوڕەگەزبازیی لەبەر خودی هاوڕەگەزبازیی نەبوو، بەڵکو هێرشێك بوو دژی هەر پەیوەندییەکی سێکسی بەشێوەیەکی گشتی.. «پیاوی فاسد ئەو کەسەیە ڕوودەکاتە خۆشەویستی عەوام واتە عەشقی جەستە نەك روح، جا ئەم جەستەیە هی ژن بێت یان نۆکەر، ئەو کەسە بۆ خۆشەویستییەکەی دڵسۆز نییە، لەسەر پەیمانی خۆیشی نامێنێتەوە، چونکە ئەوەی عاشقی بووە نامێنێتەوە. کاتێك جوانی جەستە دادەڕزێت ئیدی خۆشەویستییەکەی بەرەو کەسێکی تر ئاراستە دەکات و بەڵێن و پەیمانەکانی وەك خەون دەبنە هەڵم، بەڵام خۆشەویستی ئۆرستۆکراتی هەتا لە ژیاندا بێت خۆشەویستییەکەیشی دەمێنێتەوە، چونکە ئەوەی بۆتە جێگای

شەیدابوونی هەتا ژیان بمێنێت، ئەویش دەمێنێتەوە».. (خوان ١٨٣هـ گ ــ لا٥١٥).

ئەگەر کەمێك ئاوڕ لە دیالۆگەکە بدەینەوە دەبینین "ئەرستۆڤان" بە ڕێگەکی دیکە ڕەخنە لە هەمان ئەم بیرۆکەیە دەگرێت. خواوەندەکان لە سەرەتاوە مرۆڤیان بە یەك بوونەوەر دروست کرد، ئەم بوونەوەرە بەڕادەیەك بەهێز بوو کە بووە بوونەوەرێکی ترسناك تا ئەو ڕادەیەی هێرشی برد بۆ خوداکان (١٩٠جـ)، بۆیە زیۆس سەرتاپای بوونەوەرەکەی کرد بە دوو کەرتەوە، ئیدی هەر کەرتێکیان بەدوای ئەوی دیکەیاندا دەگەڕێت، خۆ ئەگەر بە یەك بگەن بە توندی باوەش بە یەکدا دەکەن وەك ئەوەی بیانەوێت ببنەوە بە یەك بوونەوەر (١٩١ب گ ــ لا٥٢٢)، ئینجا زیۆس ئامرازی وەچەخستنەوەی لە پێشەوە بۆ دروستکردن تا لە ڕێگەی پەیوەندی نێرینە بە مێیینەوە ڕەگەزی خۆیان بپارێزن «ئەو نێرینانەی کە لە کەسی نێرەمووکەوە (بوونەوەری هاوبەش لەنێوان هەردوو ڕەگەزەکە) پەیدابوون عاشقی ژنان دەبن و بایەخیان پێ دەدەن و زیناکەرەکانیش هەر لەمانەن، ئەو ژنانەیش کە عاشقی پیاوان دەبن و خۆیانیان بۆ دەخەنە نارەحتییەوە بە هەمان شێوە. بەڵام ئەو ژنانەی لە مێینەوە لەت بوون عاشقی کچانی ڕەگەزەکەی خۆیان دەبن و گرنگی بە پیاوان نادەن. بەڵام لەتی نێرینەکان —کە نیوە نێرەکە بوون ــ مەیلیان بۆ نێرینەکان هەیە و بۆ ئەوانی تر نا، بە نزیکبوون و پەیوەندی لەگەڵ ئەوان دڵخۆش دەبن. ئەمانە هەر لەوکاتەوەی دروست بوون لە خۆیاندا باشتر بوون، زیاتر لەنێو ئەماندا خەسڵەتە پیاوانەکان هەیە نەك خەڵکانی تر و هەندێك بە خوێڕی و شەلاتیی دەیانبینن، بەڵام ئەمانە زۆر بەهەڵەدا چوون، شەلاتیبوون ئەنگێزەی کارەکانیان نییە، بەڵکو لاوێتی و ڕوحی بەرز و بەهێزی پیاوەتییە کە پاڵیان دەنێت بۆ هاوڕێیەتی هاوکوف و هاوشێوەی خۆیان.. هاوڕێیەتییەکانیان نە دەستکەوت و نە قازانجی لە پشتەوە نییە. کەسیش ناتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات تەنیا زمانی سێکسی بەختەوەرییان بۆ وەدی

دێنێت».. (١٩٢جـ ــ بەرگی١ ــ لا٥٢٣)، ئەویندار دەیەوێت لەگەڵ یارەکەیدا یەك بگرێت و ئەویندار و یار ببنە یەك کەس.. (١٩٢هـ ــ بەرگی١ ــ لا٥٢٤).

بەڵام سوکرات کە لەدوای هەمو ئەم کەسانەوە دەدوێت تیۆری ئەفلاتون لەبارەی خۆشەویستییەوە دەخاتە ڕوو، ئەمەش لە ڕواڵەتە گشتییەکانیدا لەگەڵ بۆچوونەکانی پێشتریدا دەگونجێت، بۆیە دەگێڕێتەوە ژنێك بە ناوی "دیۆتیما DIOTIMA" بۆی گێڕاوتەوە خۆشەویستی چۆن لەدایك بووە، دایکی لە لەدایکبوونی ئەفرۆدێتدا سکپڕبووە بۆیە تاسەیەکی زۆری بۆ جوانی تێگەڕاوە، کاتێکیش حیکمەت شتێکی جوانە، ئیدی خۆشەویستی بۆتە خۆشویستنی حیکمەت، چونکە ناوەندی حیکمەت و جەهلە، باوکی حەکیمێکی شارەزابوو دایکیشی جاهیلێکی نەدار —بەگشتی خۆشەویستی ئارەزوویەکە بۆ دارابوونی هەمیشەیی چاکە، لەبەرئەمەش بە هەمان ئارەزووی بۆ چاکە ئارەزووی لە جاویدانەگیشە، لەمەیشەوە دەبێت خۆشەویستی خۆشویستنی نەمریی بێت وەك خۆشویستنی چاکە (٢٠٦أ ــ و ٢٠٧ ــ بەرگی١ ــ لا٢٣٧-٢٣٨). وێنەی نزمی خۆشویستنی جاویدانەگی کە لای ئاژەڵان دەیبینینەوە لە پاراستنی ڕەچەڵەك و درێژکردنەوەی ڕەگەزەکەدایە «ئەمەش لەبەرئەوەی سروشتی فانی ستایشی مانەوە و نەمریی دەکات و ئامرازەکەیشی بۆ ئەمە لە دایکبوونی نەوەی نویێ و وەچەخستنەوەیە، لەدایکبوون تاکە نوێیە لەدایکبووەکە دەخاتەوە بری تاکێکی مردوو (٢٠٧ج) ــ بەڵام ئەگەر ئەمە شێوە نزمەکەی خۆشویستنی نەمرییە ــ واتە منداڵخستنەوە، ئەوا شێوەیەکی باڵاتر هەیە کە منداڵی باڵاتر لە مرۆڤ دەخاتەوە چونکە نەمرن و جوانیشیان لەسەرووی جوانی منداڵی مرۆڤەوەیە، گومانیشی تێدا نییە خەڵکی ئەم منداڵانە بە باشتر دەزانن».. کێ هەیە بەچاوی ڕێزەوە لە هۆمیرۆس و هزیۆد و کەڵە شاعیرەکانی تر نەڕوانێت لەبەر ئەو منداڵانەی بۆیان جێ هێشتووین؟ بۆنموونە بڕوانە لە لیکۆرگۆسی یاسادانەر و ئەو منداڵانەی بۆ سپارتەی جێ هێشتوون، نەك هەر لە بەرژەوەندی سپارتەیە بەڵکو لە بەرژەوەندی هەموو یۆنانە. ئێوەی ئەی خەڵکی ئەسین کە ڕێز لە سۆلۆن دەگرن: ئایا لەپێناو ئەو

یاسایانەدا نییە کە لەدوای خۆی جێی هێشتوون؟ هەمان ئەم بارودۆخە خەڵکی یۆنان و جگە لە یۆنانیش دەگرێتەوە، ئەوانەی کە شوێنەواری بەرز و بەنرخیان جێ هێشتووە و.. بەهۆی منداڵە ڕوحییەکانەوە پەرستن و ستایشی مرۆڤیان بۆ خۆیان بەدەست هێناوە، ئەمەش هەرگیز بەهۆی منداڵی گۆشتن و خوێن بۆ مرۆڤ مەیسەر نابێت».. (٢٠٩جـ هـ ـ ل٥٤١).

بەڵام با وا دابنێم من ئەمەوێت ئەم خۆشەویستییە ئایدیالییە ئەفلاتونییە فێر ببم ـ واتە خۆشەویستی جوانی، ئەی چۆن دەتوانم بۆ ئەم ڕێگەی جاویدانەگییە سەربکەوم؟ .. «ئەگەر تۆ ئەتەوێت فێر بیت چۆن بەم ڕێگە جاویدانەدا سەربکەویت، ئەوا ئەتوانیت لە گەنجیتدا لە جوانی مادیی، جوانی جەستەوە دەست پێبکەیت، ئینجا سەرکەویت بۆ قۆناغێکی بەرزتر کە جوانی ڕوح و جوانی جەستە لێك جیاکراونەتەوە. ئینجا لەو جوانییە ڕادەمێنێت کە لە کار و ڕێکخستنە جیاوازەکاندا دەردەکەوێت، ئەوکاتە بێ قیمەتی و کاڵ و کرچیی جوانی مادییت بە بەراورد بە جوانی ڕوحی بۆ دەردەکەوێت».. کەواتە ئێستە ڕێگەکەم زانی! لە جوانی جەستەوە دەست پێدەکەم، ئینجا هەنگاو بە هەنگاو سەردەکەوم هەتا دەگەمە جوانی ئەزەلی کە نە دروستبوون و لەنێوچوون دەناسێت و نە مەرگ و لەدایکبوون ـ بەڵام ئەی لە جەستەی کێ-وە دەست پێبکەم؟ جەستەی ژن؟ ڕەنگە ئەمە دۆخە سروشتییەکە بێت، بەڵام ئەفلاتون بۆچوونی جیاوازە. کاتێك مرۆڤ پەی بەم جوانییە باڵایە دەبات بە دەستپێکردن لە جیهانی هەستەکییەوە و پشت بەستن بە خۆشەویستی نۆکەرەکان، لە ئامانجەکەی نزیك ئەبێتەوە، هەر ئەمەیە ڕێگای دروست بۆ نزیك بوونەوەی لە نهێنییەکانی خۆشەویتی» (خوان ٢١١). بە بۆچوونی سوکرات ئەوەی دەیەوێت دوای ڕێگای دروست بکەوێت دەبێت هەر لە منداڵییەوە خۆی بخاتە نێو ڕامان لە "جوانی مرۆیی".. «خۆ ئەگەر ڕێنماکە ڕێنمایی باشی پێ بدات ئەوا یەکەمجار لاوێکی جوانی خۆش دەوێت (٢١٠).. بەڵام کاتێك بەسەر شتە زەمینییەکاندا سەردەکەوێتە سەرێ ئیدی دوای ئەوە گرنگی بە زێڕ یان پۆشاکی ڕازاوە یان بە جوانی نۆکەر و گەنجان

نادات»..(۲۱۱جـ ـــ بەرگی۲ ـــ ل٥٤٣). ئەو تێبینییەی کە بە ڕاستی پیاهەڵڕوانین بە "ئەوینی ئەفلاتونی"ـدا دەوەستێنێت ئەوەیە کە ئەو لە "هاوڕەگەزبازی"ـیەوە وەك خۆشەویستییەکی جەستەییانەی هەستەکی دەست پێدەکات و دەبێت خۆمانیشی لێ دەرباز بکەین چونکە کارێکی "دژە سروشت"ـە و داهێزرانی مرۆڤایەتی مرۆڤە و «هێنانە خوارەوەی پیاوە بۆ ئاستی ژن»..هتد، بەڵام لەم مومارەسە شازە ناسروشتییانەوە ناگوزەرێت بەرەو مومارەسەی سروشتی، مەبەستم لەمەیش سێکسی دوو ڕەگەزەکەیە یان پەیوەندی نێوان ژن و پیاو، بەڵکو لێیەوە دەگوزەرێت بەرەو خۆشەویستی ڕاستەقینە کە "خۆشەویستی نێر و نێرە" وەلێ بە ڕوح نەك بە جەستە. بەرهەمی ئەم خۆشەویستییەش "منداڵان"ـی ڕوحین نەك مادی.. ئەمەش نەمریی ڕاستەقینەیە چونکە بەرهەمهێنانی منداڵ لە مرۆڤیش لە بەرهەمی مادییە و بەهاکەی زۆر کەمترە لە بەرهەمی ڕوح.

ئەوەی دەبێت زۆر باش ئاگامان لێی بێت ئەوەیە کە باڵابوون و هەڵکشان بە سێکس، هیچ نییە جگە لە باڵابوون بە سێکسی هاوڕەگەزیی نەبێت «ئەگەر ئێمە هاوڕەگەزبازی و ئیمان بەوەی کە سێکسکردن لە پشتەوە دژ بە سروشتە و داڕزانی نەك تەنیا مرۆڤایەتی مرۆڤە بەڵکو داڕزانی ئاژەڵبوونیشیەتی لە زەینی ئەفلاتووندا بە پاڵ یەکەوە دابنێین، ئەوا زۆر شتمان لە بنەڕەتی ئەو بیرۆکەیە ڕاڤە کردووە کە دەڵێت لایەنی جەستەیی لە خۆشەویستیدا دەبێت سەرکوت بکرێت و تێپەڕێنرێت تا بتوانین بگەینە بابەتی ڕاستەقینەی خۆشەویستی ئەویش هیچ نییە جگە لە خودی ئایدیای جوانی، بەم جۆرە دەتوانین بە ئاسانی لە تیۆری ئەوینی ئەفلاتونی تێبگەین ئەویش لە زۆر لایەنییەوە بەرزکردنەوەی پاڵنەرە بێزراوەکانە»[200]. واتە بۆ لابردنی هاوڕەگەزبازیی سێکسی ڕەگەزی دووەمیش کە ڕێگای سروشتییە وەك ئەڵتەرناتیڤ باسی لێوە نەکراوە، سوکرات دەڵێت: «ئەوانەی کە غەریزەی داهێنەرانەی خۆیان بە ئاراستەی سێکسدا دەبەن ئەوا غەمیان هەموو دەبێتە ژن، خۆشەویستییەکەیشیان تەواو سێکسی دەبێت و دەیانبینیت پێیان وایە بە منداڵ خستنەوەی نەمریی خۆیان مسۆگەر دەکەن.

بەڵام کەسانی تر هەن کە ئارەزوویان ئارەزوویەکی داهێنەرانەی ڕوحییە، بە ڕوح سکپڕ دەبن نەك بە جەستە و نەوەی ڕوحی دەخەوە کە حیکمەت و فەزیلەتە» (خوان ٢٠٩-بەرگی١ ــ لا٥٤٠). "سکپڕیی ڕوحی" لای پیاو بەرزترە لە سکپڕی جەستەیی لای ژن، لەبەرئەمە سوکرات لە "تیتیاتوس"ــدا شانازی بەوە دەکات کە مامانی پیاوە، دەڵێت: «من مامانی پیاوم نەك ژن، من دەستبەسەر دەروونەکاندا دەگرم نەك جەستەکان. خاسیەتی جیامەندی ئەو هونەرەی کە من پیادەی دەکەم ئەوەیە توانای سەلماندنی ئەوەی هەیە کە ئایا جۆری ئەو بیرکردنەوەی لە گەنجانەوە دەکەوێتەوە تارماییەکی وەهمییە، یان بەرهەمی ژیانێکی ڕاستەقینەیە» (١٥٠ ــ بەرگی ٣ ــ لا٢٤٤).

لێرەدا سوکرات شانازی بەوە دەکات کە بەرزترە لەو مامانە ژنانەی کە هەندێك کات ناتوانن سکپڕیی ڕاستەقینە و سکپڕیی درۆینە لەیەکتر جیابکەنەوە! لەمەشەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە تیۆری ئەفلاتون لە بارەی ئەوینەوە بە تەواوەتی ژن دووردەخاتەوە، ژنە نە ئەو سەرەتایەیە عەشقی جەستە لێیەوە دەست پێ دەکات و نە لە کۆتاییشدا ئەو لایەنەیە کە عاشقی ڕوح پێی دەگات. بەڵکو "نۆکەر" سەرەتای هەستەکییە و "پیاو کۆتایی ڕوحییە". ڕاڤەکەرانی چەندین ڕێبازی فیکری ڕاڤەی ئەم هەڵوێستە سەیرەی ئەفلاتونیان کردووە، ڕەنگە گرنگترینیان ئەوە بێت کە جۆرج فلاستوس G. VLASTOS گوتوویەتی کە پێی وایە ئەفلاتون مومارەسەی هاوڕەگەزبازیی کردووە و هێرشەکەیشی دژی هاوڕەگەزبازیی و لەقەڵەمدانی بە "دژە سروشت"، یان بە داڕزانی مرۆڤبوونی پیاو و..هتد تەنیا جۆرێك لە گرێی هەستکردن بە تاوانی کۆنە»[٢٠١]. بەڵام جۆرج سارتۆن وای دەبینێت «مەرج نییە لەمەوە ئەفلاتون لەو کەسانە بێت کە بە واتایەکی ڕاستەقینە نێربازیی لادەبەن. بەڵکو خەریکە لەوە دڵنیابینەوە کە خۆی بە شازیی سێکسی تووشبووە: ئەو هەرگیز هاوسەرگیریی نەکردووە، هەندێ کاتیش کە باس لە پەیوەندی سێکسیی نێوان پیاو و ژن دەکات قسەکانی لە هەر عاتیفەیەك خاڵییە. بەڵام هەستە ناسکەکانی بە پەیوەندییە

شازەکان لەگەڵ هاوڕەگەزەکەی خۆیدا هەڵدەچێت. ئەو لەوانە بووە کە کینەی بەرامبەر ژن هەبووە، ئەمەش لە نێو کتێبەکانیدا دەردەکەوێت».. [٢٠٢].

هەندێکی دیکە پێیان وایە ئەفلاتون هاوسەرگیریی نەکردووە، کتێبەکانیشی دەری دەخەن ئەو هیچ مەیلێکی سێکسی بۆ ژن نەبووە [٢٠٣].

بەڵام ئەگەر هۆکارگەلێکی کەسەکی لە ژیانی ئەفلاتوندا هەبووبن وایان کردبێت هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ "هاوڕەگەزبازی"ـدا نەرمی بنوێنێت، کەچی لە کۆتاییدا میتافیزیکاکەی بەسەر فەلسەفەکەیدا زاڵ بوو، ئەو میتافیزیکایەی لەسەر "ڕوح" دامەزراوە و حەقیقەتی کردۆتە شتێکی شاراوەی جیهانێکی دابڕاو لەم جیهانە هەستەکییە گۆڕاوە کە تەنیا بە ڕوح دەتوانیت بۆی سەرکەویت، وەك هیگڵیش دەڵێت تەنیا ڕوحە کە حەقیقەت دەناسێت. ئەگەر سەرکەوین جیهانێکی عەقڵیی بێ گەردی ئەزەلی دەبینینەوە کە نە مانای دروست بوون دەزانێ و نە مانای لەنێوچوون.. ئەمە ئەو میتافیزیکایە بوو کە لە کۆتاییدا باڵی کێشا بەسەر دەروون و فیکری ئەفلاتوندا، ئەمەش وای لێکرد هێرشێکی توند بکاتە سەر هاوڕەگەزبازیی و بە "داڕزان" وەسفی بکات و پەیوەندی سێکسی پیاو ژنیشی لە بەرتەسکترین سنووردا و تەنیا بە مەبەستی وەچەخستنەوە بۆ هێشتنەوەی ڕەگەزی مرۆیی کورت کردۆتەوە، بەڵام دەڵێت ئەی ئەگەر ئەفلاتون ڕقی لە هەموو جۆرە پەیوەندییەکی سێکسی بووە و هەر لە بەرئەمەش هاورگەزبازیی قەدەغە کردووە، ئەی بۆچی ئەم قەدەغەکردنە پەیوەندی سێکسی ژن و پیاویشی نەگرتۆتەوە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ناچارین کەمێك بگەڕێینەوە بۆ بۆچوونی ئەفلاتون لەبارەی مادەوە و گومانیشی تیا نییە ئەو ڕقی لە مادە بووە و بە ڕەگەزی خراپە لە جیهاندا (سیاسی ٢٧٣ب ــ بەرگی ٣ ــ لا٤٨٤) و هۆکاری شێرازەتێکدانی گەردوون وەسفی کردووە (تیماوس ٣٠ب ــ بەرگی٣ ــ لا٧١٧). لێرەوە دەبوو ئەم ڕقەی ئەو جەستەش بگرێتەوە، بەم جۆرە جەستە لای ئەفلاتون بووە خراپەیەکی دووفاق، لەلایەکەوە ئامرازی شێواندنی حەقیقەتە و لەلایەکی دیکەیشەوە سەرچاوەی شەهوەتەکانە. بێگومان فەیلەسوفی حەقیقەت

﴾مەبەست لە ئەفلاتونە﴿ بە جەستە و هەرشێك لە پێویستی سروشتی زیاد بێت قەڵسە، ئەو دەیویست خۆی لە جەستە ڕزگار بکات و بگەڕێتەوە بۆ ڕوح (فایدۆن ٦٤). ئەتوانین دەقی بێ شومار دەربارەی ڕقی ئەفلاتون لە جەستە و بینینی جەستە وەك گۆڕ بهێنینەوە، دیالۆگی فایدۆن پڕیەتی لە نموونەی ئەم جۆرە دەقە. بەڵام وێڕای ئەوەش ئەفلاتون خۆکوشتن لە فەیلەسوف قەدەغە دەکات «وێڕای ئەوەی مرۆڤ زیندانیی جەستەیە بەڵام مافی ئەوەی نییە دەرگای زیندانەکەی بکاتەوە و لێی هەڵێت» (فایدۆن ٦٢ ب)، چونکە مرۆڤ خۆی ئەم جەستەیەی بەخۆی نەبەخشیوە تا مافی ئەوەیشی هەبێت جێی بهێڵێت بەڵکو خودا دروستی کردووە و نابێت خاپوور بکرێت «ئێمە موڵك و ماڵی خواوەندەکانین» (٦٢ جـ)، کەواتە دەبێت فەیلەسوف ئەوەندە بخوات و بخواتەوە کە زیندوو بمێنێت، واتە دەبێت بە پێی پێویستی مانەوە بخوات و بخواتەوە ئەگەر نا خۆکوژیی کردووە، ئەوەی لەبارەی تاکەوە دەوترێت بۆ جۆریش دروستە. قەدەغەکردنی تەواوەتی سێکس جۆرێکە لە خۆکوشتنی جۆر ـــ دەبێت جۆر بمێنێتەوە، خۆ ئەگەر جەستە خۆراك بۆ مانەوە وەربگرێت، ئەوا دەبێت مرۆڤیش مومارەسەی سێکس بکات تا جۆر بمێنێتەوە و بەشدار بێت لە نەمرییدا لە ڕێگەی منداڵبوونەوە (یاساکان ٧٢١ ـــ بەرگی٤ ـــ لا٢٩١). هەمان ئەم کارە ئاژەڵانیش لە ڕێگەی "خۆشەویستی سێکسی"ـیەوە ئەنجامی دەدەن، ئەمەش دەبێتە مایەی وەچەخستنەوە و لەدایکبووە نوێیەکە جێگای تاکە مردووەکە دەگرێتەوە. بەم جۆرە جۆریی ئاژەڵ و مرۆڤ دەمێننەوە (خوان ٢٠٧). لەبەرئەمە نابێت پێمان سەیر بێت کە ئەفلاتون بە زمانێکی وشکی بێ هەست و سۆز قسە لەبارەی پرۆسەی سێکسی نێوان پیاو و ژنەوە کردووە، چونکە ئەمە لە تێڕوانینی ئەودا پرۆسەیەکی میکانیکییە و تەنیا ئامانجی وەچەخستنەوەیە بۆ پاراستنی جۆر!

# کۆتایی

لە هەموو ئەوانەوەی باسمان کردن بەو دەرەنجامە دەگەین ئەفلاتون لە چوارچێوەی ئەو ترادسیۆنە یۆنانییە دەرنەچووە کە لە ناخی خۆیدا دوژمنایەتی، ئەگەر نەڵێین ڕق و کینەی بەرامبەر بە ژن هەڵگرتبوو، ئینجا ئەوە ڕاست نییە کە دەوترێت ئەفلاتون یەکەم کەس بووە بانگەشەی بۆ "ئازادبوونی ژن" کردووە، یان یەکەم کەس بووە بانگەشەی بۆ یەکسانی لەنێوان هەردوو ڕەگەزەکە کردووە و لە جیهانی دێریندا پەیامبەری مافی ژن بووە، پێشتر بینیمان گوزارشتەکانی یەکسانی لە "کۆمار"دا "فریودەرانە"یە و بۆ خودی خۆی نەخوازراوە، بەڵکو بەرەنجامی لەنێوبردنی موڵکایەتی و هەڵوەشاندنەوەی خێزان و ئینجا لەنێوچوونی ڕۆڵی تەقلیدییانەی ژن وەك کەیبانووی ماڵ بوو، چونکە ئیدی ماڵ لە گۆڕێدا نییە، ئیدی هیچیش بۆ ئەفلاتون نەمابووەوە جگە لەوەی ژن بگۆڕێت بۆ پیاو بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو بنەما پەروەردەییانەیدا بگونجێت کە بۆ هەر تاکەکەسێك وەزیفەیەك دیاری دەکات.

بەڵام تەنانەت لە دیالۆگی کۆماریشدا ئەگەر ماڵ ــ لە چینی خوارەوەدا مابایە ئەوا ژنیشی هەر وەك کەیبانووی مال دەهێشتەوە. خۆ ئەگەر مەسەلەکە ئازادکردنی ژن بووایە ئەوا ئەفلاتون بێ دەنگی لە ژنی چینەکانی خوارەوە نەدەکرد بەتایبەت، وەك جۆرج سارتۆن دەڵێت، ئەگەر بە ڕاستی زانیمان ئەم چینە لایەنی کەم لەسەدا هەشتای کۆی دانیشتوانەکەی پێکهێناوە.

بەڵگەی ڕاستی ئەو بیرۆکەیەی باسمان کرد ئەوەیە کاتێك لە دیالۆگی یاساکاندا موڵکایەتی دەگەڕێتەوە، دیسان خێزانیش گەڕایەوە و ڕۆڵی ژن لە ژیانی سیاسیدا ون بوو، ژن نە ئەندامە لە "پاسەوانەکانی یاسا"ــدا و نە لە کاروباری دەوڵەت و نە لە هیچ ئەنجومەنێکی نوێنەراندا، بەڵکو ڕۆڵی تەنیا لە لیژنەی سەرپەرشتیکردنی هاوسەرگیریدا هەبوو کە ئەم لیژنەیە لە پیرەژنەکانی ئەسینا پێکهاتبوو! بەم جۆرە جیاکاری لەنێوان دووڕەگەزەکەدا لە بواری پەروەردەی جەستەیی وسەربازیدا دەرکەوتەوە کە ئەو ژنانەی دەچوونە سەرووی پەنجا سالییەوە تیایدا سەرپشکبوون. هەروەها میوزیك بۆ دوو جۆر

دابەش بوو "پیاوانە" و "ژنانە". جیاکارییەکە دەگاتە ترۆپکی خۆی ئەگەر باس لە تاك هاوسەریی بکەین کە بنچینەی دروستکردنی خێزانە، ئەوەتا لێرەدا دەسەڵاتەکانی باوك بێ سنوورە، ژن لە هاوسەرگیریدا بۆچوونی نییە، لە میراتیشدا بێ مافە، ئەفلاتون بەدوای "سەرپەرشت" یان هاوسەرێکدا دەگەڕێت تەنانەت لەنێو نەوەی نەوەکانیشدا و بگرە لە دەرەوەی شاریش تا کچ شووی پێ بکات و بتوانێت ببێتە میراتگر: گرنگ ئەوەیە پیاوێك هەبێت! هەروەها سەرپەرشتێکی گشتیش بەسەر پەروەردە و فێرکردنەوە!

ئەگەر بچینە سەر ئەوینە ئەفلاتونییە بەناوبانگەکە، دەبینین هیچ پەیوەندییەکی بە ژنەوە نییە، چوون بە عەشقی جەستەیی نۆکەر دەست پێدەکات و بە خۆشەویستی ڕوحی نێوان پیاوان تەواو دەبێت، بەڵام خۆشەویستی ڕوحی لەنێوان پیاو و ژندا نابینیتەوە! خۆ ئەگەر ئەو هێرشی کردۆتە سەر هاوڕەگەزبازیی «ئەوا ئەمەی لە بەرژەوەندی نا هاوڕگەزبازیی نەکردووە، بەڵکو ئەو هەر خۆی ڕقی لە هەموو جۆرە پەیوەندییەکی سێکسی بووە و کەمترین سنووری بۆ دیاری کردووە ئەویش لەپێناو پاراستنی جۆر»!

ئەمە وێنەی ژنە لای ئەفلاتون لە دیالۆگە سیاسییە گەورەکانیدا "کۆمار و یاساکان"، ئینجا لە لەو دوو دیالۆگەیشدا کە لەبارەی خۆشەویستییەوەن "خوان" و "فایدرۆس" ـــ بەڵام ڕاستییەکەی ئەمە وێنەیەکی بڵاوە لە سەرجەم دیالۆگەکانیدا و تۆ دەتوانیت لێرە و لەوێی دیالۆگەکانیدا گوزارشتی وەها بدۆزیتەوە کە خاوەنی دەلالەتی تایبەتی ئەوتۆن و جەخت لەسەر بیرۆکەکەی پێشوو دەکەنەوە، ئەویش دەرنەچوونی ئەفلاتونە لە ترادسیۆنی یۆنانیی دژە ژن. بۆ نموونە ئەو لە کۆتایی ژیانیدا لە دیالۆگی تیماوس دا بۆمانی دەگێڕێتەوە «ژن چۆن ئافرێنراوە» و دەڵێت «سروشتی مرۆیی دوو جۆرە: ڕەگەزی باڵا و لەمەودوا ناوی دەنێن "پیاو"» (تیماوس ٤٢أ). ئەی ژن، یان بە گوێرەی گوزارشتێکی جوانی سیمۆنە دی بۆڤوار "ڕەگەزەکەی تر"، لە کوێوە هاتووە؟ لە "پیاو"ەوە بەڵام لە هەموو پیاوێکەوە نا: ئەو پیاوانەی شەهوەتەکانی خۆیان سەرکوت دەکەن و فەزیلەتمەندانە لەسەر زەمین دەژین دەگەڕێنەوە بۆ ئاسمان، ئەو شوێنەی ئەستێرە ڕاستەقینەکەیانی لێیە.. بەڵام ئەوەی لەم کارەدا شکست دێنێت و

دەبێتە کۆیلەی شەهوەتەکانی و بە خراپەکاری و سەرشۆڕیی دەژی.. لە لەدایکبوونەوەی دووەمیاندا دەگۆڕێن بە ژن.. خۆ ئەگەر دوای ئەوەش هەر باش نەبوو دەگۆڕێت بۆ وێنەی ئاژەڵێکی هاوشێوەی ئەو سروشتە خراپەی لێیەوە هاتووە» (تیماوس ٤٢جـ ـــ بەرگی٣ ـــ ل٧٢٨). بەم جۆرە لای ئەفلاتون ژن یەکەمجار پیاو بووە، ئینجا لە پیاوە شەنگێز و خراپەکانەوە ژن پەیدا بووە! ئەو تەنیا بەوەوە نەوەستاوە کە کتێبی پیرۆز دەڵێت ژن لە پەراسووی پیاوێکی نوستووەوە دروست کراوە (سفر التكوين و إصحاح: ٢١-٢٢)، بەڵکو ئەوەی بە مەرج گرتووە ئەم پیاوە پیاوێکی خراپەکار و فاسد بووە و خووڕەوشی لەم دنیایەدا بەرەو باشی نەچووە بۆیە وەك سزای ڕەوای خۆی گۆڕاوە بۆ ژن!

پاشان ئەفلاتون لە هەمان دیالۆگدا دەگەڕێتەوە بۆ سەر هەمان بیرۆکەی بنەڕەتی مێینە و دەڵێت «بەڵام پیاوان کە لەسەر ئەم زەمینە دەرکەوتن، ڕەنگە شیاو بێت گریمانەی ئەوە بکەین ترسنۆکەکانیان یان ئەوانەی بەشێوەیەکی فاسد ژیاون لە لەدایکبوونی دووەمیاندا دەگۆڕێن بۆ سروشتی ژن، هەر ئەمەش هۆکاری ئەوەی کە خواوەندەکان ڕێك لەو کاتەدا سێکسکردنیان تێدا دروست کردووین».. (تیماوس ٩١أ ـــ بەرگی ٣ ـــ ل٧٧٨).

ڕەنگە کەسێك ڕەخنەی ئەوە بگرێت "تیماوس" وێنەیەکی شعری دەنوێنێت کە فەیلەسوفەکە ﴿مەبەست ئەفلاتونە﴾ تێیدا کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەو وتانەی "هزیۆد"ەوە کە لە "کارەکان و ڕۆژەکان"ــدا لەبارەی ئافراندنی ژنەوە دەری بڕیون ـــ بەڵام وەڵامی ئێمە ئەوەیە ئەفلاتون لە زۆرێك لە دیالۆگەکانیدا وا وێنای ژن دەکێشێت کە بە سروشتی خۆی لە پیاو نزمترە، بۆ نموونە ئەو لە کۆتایی "یاساکان"دا لەبارەی پیاوە ترسنۆکەکانەوە دەدوێت کە لە مەیدانی جەنگدا چەکەکانیان فڕێ دەدەن و بۆی هەڵدێن.. بڕوانە سزاکەیان چییە؟ دە بڕوانە چی دەڵێت «سزای ڕەوا بۆ ئەو کەسە چییە کە چەکەکەی فڕێ دەدات کە هەقوایە بەرگری بژاردەی یەکەمی بێت؟ ترادسیۆنی ئێمە وا دەگێڕێتەوە کچی "کاینۆس CAENEUS" ــی خەڵکی تسالیا خواوەندەکان لە ژنەوە کردویانە بە پیاو[٢٠٤]. بەڵام ئێستە ناتوانین ئەم پەرچۆیە پێچەوانە بکەینەوە،

کەواتە ئەگەر پرۆسە پێچەوانەکە شیاو بووایە، ئەوا بۆ پیاوێك کە قەڵغانەکەی فڕێ دەدات هیچ شتێك لەو پرۆسەیە گونجاوتر نەدەبوو. بەڵام ئەمە مەحاڵە بۆیە دەبێت یاسایەك دابنێین کە بەپێی توانا لەم چارەسەرە نزیکمان بخاتەوە، خۆ ئەوەی ژیانی خۆی ئەوەندە خۆش بوێت و لای شیرین بێت ئەوا لە هەموو ژیانیدا نایخەینەوە بەردەم مەترسی بەڵکو وای لێ دەکەین بۆ ئەبەدی بژی، بەڵام ژیانێکی سەرشۆڕانە و ملهوڕانە».. (یاساکان ٩٤٤هـ ــ بەرگی ٤ ــ ل٥١٥-٥١٦).

دواجار ئەوانەی پێیان وایە ئەفلاتون پشتیوانی ژن بووە خۆ ناتوانن نکوڵی لەوە بکەن کە هەمیشە ژنی لەگەڵ منداڵان و ئاژەڵان و کۆیلەکاندا داناوە»..هتد. (تیتانوس ١٨١حـ)، ئەو لەبارەی شتی "ژنانە" و "شێوازی ژنانە" و "ڕێگای مێینە" و پۆشینی بەرگی ژنانە و..هتد بە ڕقێکی زۆرەوە قسە دەکات! بگرە ئەو لە کرداریی سێکسیی هاوڕەگەزبازیدا ڕقی لە ڕەوشی "نەرێنی ژنانە" بوو. وێڕای هەموو ئەوانەش تۆ یەك تاکە کەسایەتی ژن لە هیچ کام لە دیالۆگەکانیدا نابینیتەوە.. بەو دیالۆگانەشەوە کە لەبارەی خۆشەویستییەوە دەدوێت. جۆرج سارتۆن ئەو دیمەنە نامرۆڤانەیە دەردەخات کە ئەفلاتون تێیدا وێنای ئەکزانسیپی ژنی سوکراتی کردووە کە لە دوا ڕۆژەکانی خۆیدا بە بچووکترین منداڵییەوە سکپڕبوو، لەم سەروەختەدا سوکرات ڕوودەکاتە ئەکریتۆن بێ ئەوەی هەست و سۆزی ئەو ڕەچاو بکات وپێی دەڵێت «کەسێك بیگەڕێنێتەوە بۆ ماڵ». "سارتۆن" دەڵێت: «ئەگەر ئەم وتە تەمێکارە کە "زینەفۆن" لە یادەوەرییەکانیدا باسی کردووە بەو گوزارشتە دزێوە بەراورد بکرێت کە ئەفلاتون وتوویەتی ئەوا دەبینیت ئەم دیمەنە وەسفی کەسێکی ڕق ئەستوور بەرامبەر بە ژنان دەکات»[٢٠٥]!

بەڵام ئایا ناتوانین هیچ ڕادەیەکی هاوسۆزی ئەفلاتون لەگەڵ ژنان لای ئەفلاتون ببینینەوە؟ ڕاستە ئەو هاوسەرگیریی نەکردووە، هیچ مەیلێکی بۆ ژنانیش لێ دەرنەکەوتووە و نەشمان بیستووە هیچ ژنێك لە ژیانیدا بووبێت..هتد بەڵام ئایا ستایشی "سافۆ SAPPO" ــی خانمە شاعیر ناکات کە سوکرات پێی دەووت "شۆخ و شەنگ"؟ (فایدرۆس ٢٣٥جـ ــ بەرگی٣ ــ ل١٤١)، هەروەها ئەفلاتون شعرێکی پڕ

گرۆتینیشی بۆ نووسیوە.. «دەڵێن خواژنەکانی هونەر نۆ خواژنن، ئایا لەمە گەمژانەتر هەیە، دەی با بزانن بە ساڤۆی لیسبۆسییەوە دە-ن»! کاتێك وا خەریکم کۆتایی بەم توێژینەوەیەم دەهێنم هیچم بۆ وتن نییە ئەوە نەبێت کە ساڤۆ ئەوەی بەسەردا دەچەسپێت کە لە سەرەتاوە لەبارەی ژنی بیانییەوە باسمان کرد. «ڕەنگە لەمەش گرنگتر ئەوە بێت کە بە وتەی هەموو ئەو کەسانەیشی لەسەریان نووسیوە ساڤۆ ژنێکی "پیاوانە" بووە، وێڕای ئەوەی هاوسەرگیریشی کردووە، بەڵام لە شعرەکانی هیچ جێ نەماوە جگە لە یەك بەیت کە ئاراستەی مێردەکەیی کردووە»[٢٠٦]. وێڕای ئەوەی ساڤۆ قەسیدەی لاواندنەوەی زۆری لەبارەی "کچە هاوڕێکان"ـەوە نووسیوە و دەستەیەك لە کچانی پێکهێناوە بۆ ئەوەی پەیوەندی خۆشەویستیی بەهێزیان لەگەڵ دابمەزرێنێت و پێی سەیر بووە کە بۆچی ئەم پەیوەندییانە تەنیا لەگەڵ پیاواندا بەرقەرار دەکرێن؟

بەم جۆرە ڕووی کردە دروستکردنی پەیوەندی خۆشەویستی بەهێز لەنێوان کچانی ڕەگەزی خۆی و بە شعرەکانیشی گوزارشتی لەم هەست و سۆزانە کردووە و بگرە کاتێك تەماشای ناو چاوی کچانی ڕوح سووکی کردووە لە هەژمەتا هاواری کردووە! بە یەکێکیان دەڵێت: «ئەی ئەسیس من هەر لە سەردەمێکی دێرینەوە تۆم خۆشویستووە، ئەوکاتەی کە مێینەییم هەمووی گوڵ بوو»!

وێڕای هەموو ئەوانەیش وا پێدەچێت "ساڤۆ" ژنێکی جوان نەبووبێت، وەسفەکەی سوکراتیش بە زۆریی تەنیا بۆ بلیمەتییە شعرییەکەی بووە. گوڵدانێکی سەدەی چوارەمیش دۆزرایەوە وێنەی "ساڤۆ" و "کایۆس"ـی شاعیری هاوسەردەمی ئەوی لەسەر نەخشێنرابوو، ساڤۆ کەمێك لە کایۆس درێژتر بوو، بە ڕادەیەکیش لەپیاو دەچێت مرۆڤ زۆر لەوە دوو دڵ دەبێت باوەڕ بکات ئەو ڕوخسارە ڕوخساری ژنە[٢٠٧].

دەی با خوێنەر لە ئەنجامگیری ئەمە سەرپشك بێت![٢٠٨]

# سەرچاوەکانی توێژینەوەکە

**یەکەم: سەرچاوە بیانییەکان:**

1- The Dialogues of Plato _ Trans by B. Jowtter in Four volumes, Oxford at the Clarendon Press.
2- Anderson J. K.: Xenophon, Duckworth 1974.
3- Bell S. G.: Women from The Greeks to the French Revolution, Standford University press.
4- Briody, Mary (ed.): Philosophy of Women, Hackeh Publishing Company, 1983.
5- Desmond lee: Introduction to the Republic of Plato, Penguin Book, 1975.
6- De Beauvoir (Simone): The Second Sex, Trans. By H. M. Parshley, Penguin Books, 1987.
7- Donaldson, James: Women: Her position and Influence in Ancient Greece and Rome, and Among Early Christians Press N. Y., 1973.
8- Elshtain, Jean Bethke: The Family in Political Thought, The Harvester Press, 1982.
9- Engles E.: The Origin of The Family Private property and the State, Moscow, 1968.
10- Euripides: The Complete Greek Works, The University of Chigcago Press, 1956.
11- Gorman: Pythagors: A life, Routledge & Kegan Paul 1979.

12- Gurbem G.M.A.: Plato's Thought, Beacon press, Boston, 1968.
13- Jone, A.H.M.: Sparts, Balckwell 1968.
14- Kagan, Donald (ed.): Stources in Greek Political Thought, The Free Press N.Y., 1968.
15- Kennedy, Ellen Susan Mendus: Woman in Western Political Phi;osophy, The Harvester press, 1987.
16- Keula, Eva: The Reign of The Phallus Sexual, Politics in Ancient Athens, University of Califirnia Press, 1993.
17- Morrow, Glenn R.: Plato's Cretan City, Princeton University press. N.J., 1960.
18- Nettelship, R.L.: The Theory of Education in the Republic of Plato, Teacher's College Press N.Y., 1968.
19- Pomeroy, Sarah B.: Women in Classical Antiquity, Schocken Books, N.Y., 1975.
20- Rousseu J., Emile, Trans by Barbara Foxley Exerymanis Liberary, N. 518.
21- Russell, B.: Marriahe and Morals, Routledge & Kegan Paul.
22- Shorey, Paul: What Plato said, University of Chicago Press, 1978.
23- Sinclair, T. A.: A History of Greek Political Thought, outldge& Kegan Paul, 1959.
24- Taylor, A. E.: Plato th man& hie work, Methuen, 1986.
25- Vlastos, Gregory: Platonic studies, Princeton University Press.
26- West, D.J.: Homosexuality, Penguain Books, 1968.

27- Xenophon: Memorabilia of Socrates Everyman's, library, N. 457.
28- The Encyclopaedia Americana, Vol. 20, (Art, Oneida Community).

### دووەم: سەرچاوە عەرەبییەکان :

#### أ- دەقە ئەفلاتونییە وەرگێڕدراوەکان (بۆ زمانی عەرەبی):

١- جمهورية أفلاطون ـ دراسة و ترجمة: د. فؤاد زكريا ـ الهيئة المصرية للكتاب، ١٩٨٥.
٢- محاورات أفلاطون ـ ترجمة: د. زكي نجيب محمود ـ لجنة التأليف و الترجمة و النشر، ١٩٦٦.
٣- محاورات و نصوص لأفلاطون (فايدروس ـ تياتيتوس) ـ ترجمة و تقديم: د. أميرة حلمي مطر ـ دار المعارف بالقاهرة، ١٩٨٦.
٤- أفلاطون: فيدون ـ ترجمة: د. عزت قرني مع مقدمات و شروح، مكتبة الحرية الحديثة، القاهرة، ١٩٧٩.
٥- أفلاطون: السفسطائيين و التربية ـ ترجمة: د. عزت قرني ـ مكتبة سعيد رأفت، ١٩٨٢.
٦- أفلاطون: مأدبة ـ ترجمة: د. وليم الميري، دار المعارف بمصر، ١٩٧٠.
٧- أفلاطون: في الفضيلة ـ محاورة مينون ـ ترجمة: د. عزت قرني، مكتبة سعيد رأفت بمصر، ١٩٨٢.

#### ب- مراجع عامة:

١- د. أحمد فؤاد الأهواني: أفلاطون، سلسلة نوابغ الفكر الغربي عدد ٥، دار المعارف بمصر، ١٩٦٥.
٢- الكسندر كوريه: مدخل لقراءة أفلاطون، ترجمة: عبدالمجيد أبو النجا، مراجعة: د. أحمد فؤاد الأهواني ـ الهيئة العامة للكتاب، ١٩٦٦.
٣- أرنست باركر: النظرية السياسية عند اليونان، جزآن، ترجمة: لويس أسكندر، مراجعة: د. محمد سليم سالم، مؤسسة سجل العرب، ١٩٦٦.
٤- تشارلز ألكسندر روبنصن: أثينا في عهد بركلس، ترجمة: د. أنيس فريحة، لبنان، ١٩٦٦.
٥- كوراميسون: سقراط الرجل الذي جرؤ على السؤال، ترجمة: محمود محود، مكتبة الأنجلو مصرية، عام: ١٩٥٦م.

٦- ول ديورانت: قصة الحضارة، حياة اليونان ــ مجلد ٦ و ٧، ترجمة: الأستاذ محمد بدران، لجنة التأليف و الترجمة و النشر.
٧- د. عزت قرني: الحكمة الأفلاطونية، دار النهضة العربية بالقاهرة، ١٩٧٤.
٨- د. عبداللطيف أحمد علي: التأري اليوناني ــ جزآن، دار النهضة العربية، ١٩٧٦.
٩- د. محمد كامل عياد: تأريخ اليونان ــ الجزء الأول، دار الفكر، دمشق، ١٩٨١.
١٠- د. لطفي عبدالوهاب يحيى: اليونان ــ مقدمة في تأريخ الحضاري، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٧٩.
١١- هيرودوت يتحدث عن مصر: ترجمة مصر صقر خفاجة، دار القلم بمصر، ١٩٦٦.
١٢- مونييك بيتر: المرأة عبر التأريخ، ترجمة: هنريت عبود، دار الطليعة، بيروت.
١٣- دريني خشبة: أساطير الحب و الجمال عند الإغريق ــ جزآن، دار التنوير، بيروت ١٩٨٣.
١٤- عبدالهادي عباس: المرأة و الأسرة في حضارات الشعوب و أنظمتها ــ ثلاثة أجزاء، دار طلاس للدراسات و الترجمة و النشر بدمشق، ١٩٨٧.
١٥- د. على عبدالواحد وافي: الأدب اليوناني القديم، دار المعارف بمصر.
١٦- د. وهيب سمعان: الثقافة و التربية في العصور القديمة، دار المعارف بمصر.
١٧- فتحية سليمان: التربية عند اليونان و الرومان، دار الهنا للطباعة و النشر بمصر.
١٨- عبدالمجيد عبدالرحيم: التربية و الحضارة، مكتبة النهضة المصرية بالقاهرة، ١٩٦٨.
١٩- د. عبدالغفار مكاوي: سافو: شاعرة الحب و الجمال عند اليونان، دار المعارف بمصر، ١٩٦٦.
٢٠- د. عبدالغفار مكاوي: المنقذ ــ قراءة لقلب أفلاطون (وهو يحتوي على ترجمة الرسالة السابعة لأفلاطون)، كتاب الهلال أغسطس ١٩٨٧، العدد ٤٤٠.
٢١- جورج سارتون: تأريخ العلم، ترجمة: د. توفيق طويل و د. أحمد فؤاد الأهواني و آخرون، دار المعارف بمصر عام ١٩٦١.
٢٢- سوفكليس: نساء تراخيس، ترجمة: د. علي حافظ: المسرح العالمي ــ عدد ٢٦، وزاة الإعلام بالكويت.
٢٣- عبدالسلام الترمانيني: الزواج عند العرب في الجاهلية و الإسلام، عدد ٨٠، عالم المعرفة بالكويت.
٢٤- د. ثروت أنيس الأسيوطي: نظام الأسرة بين الإقتصاد و الدين، دار الكتاب العربي للطباعة و النشر بالقاهرة.

# سەرچاوەكان

---

* إنصاف: لە زمانی كوردیدا زۆرجار ئەم وشەیە بە (دادگەری) و(دادپەروەری) و (ویژدان) و..هتـد وەردەگێڕدرێت، بەڵام ڕاستییەكەی هیچ كام لەمانە گونجاو نین، دوای بیركردنەوە و پرس و جۆیـەكی جددی ئەم وشەیەمان بۆ دۆزییەوە كە من پێم وایە لە وشەكانی تـر گونجـاوترە (هەقبەشـی).. بـەو هیوام یان وشەیەكی لەمەش گوجاوتری بۆ بدۆزرێتەوە یاخود ئەم وشەیە جێی خۆی بگرێ. (و. ك)

١- بۆ نموونە سەرنج بدە لە: د. علی عبدالواحد وافي: المرأة في الإسلام، دار النهضة مصر بالفجالة.

٢- أحیاء علوم الدین: الجزء الثاني، دار الریان للتراث، ص٥٠-٥١.

٣- المرجع نفسه، الجزء الثاني، ص٥١.

٤- المرجع نفسه، ص٦٦.

٥- المرجع نفسه، ص٥٤.

٦- "الفیلسوف و المرأة" كۆڕێكی تایبەت كە نووسەر گرتوویەتی و بەڕێوەی بردووە، و لەم گۆڤارەدا بلاوبۆتەوە: المجلة العربیة للعلوم الإنسانیة، عدد ٦٤ شتاؤ عام ١٩٩٤، بة بةشداری أ. د. فؤاد زكریا و أ. د. عبدالغفار مكاوي و أ. د. غانم هنا، و د. حسین علی حسن و الأستاذ ناهد البقصمي.

٧- المرجع نفسه.

٨- لە یەكێك لە كتێبەكانی داهاتووی ئەم زنجیرەیەدا بەناوی "ژنـە فەیلەسـوفەكان" باسـیان لێـوە دەكەین.

٩- بگەڕێوە بۆ پێشەكی ژمارەی دووەمی ئەم زنجیرەیە: "أرسطو و المرأة".

١٠- لویس مۆرگان توێژینەوەی لە هیندییە سورەكان كردووە، ئینجا بە شێوەیەكی گشتی گرنگـی بە ڕێكخستنی كۆمەلایەتی لە كۆمەڵگەی مرۆییدا داوە، بەتایبەت لە كتێبی "كۆمەڵگـەی دێـرین Ancient Society" كە لە ساڵی ١٨٧٧ دەرچووە و تێیدا ئـەو قۆناغانـەی كۆمەڵگـەی مرۆیـی پێیاندا تێپەڕیووە بۆ سێ قۆناغ دابەش كردووە: قۆناغی وەحشیگەریی، قۆناغی بەربـەری و ئینجـا قۆناغی شارستانی. ماركس و ئەنگلز بۆ پاڵپشتیكردنی تیۆرە ماتریالیزمییە مێژووییەكەی خۆیـان

سوودیان لەم تیۆرە پەرەسەندنییەی ئەم وەرگرتووە. ئەنگلز ئەو بیرۆکەیەی لێی وەرگرتووە لە کتێبی "بنچینەی خێزان و موڵکایەتی تایبەت"دا خستوویەتییە ڕوو، جگە لەویش بێرتراند ڕەسل و چەندانی تر بە هەمان شێوە سوودیان لێ وەرگرتووە..

١١- "کەواتە ئەگەر ژن خۆی دانەپۆشێت دەبێت قژی ببڕێت، چوون کە ژن بینی بە قژی بڕدرا و هەڵپاچراوەوە ناشیرینە ئیدی خۆی دادەپۆشێت". نامەی یەکەمی پۆلسی پەیامبەر بۆ خەڵکی کۆرنتۆس، ئیصحاحی یازدە: ٦.

١٢- لسان العرب لإبن منظور: المجلد الخامس، ص٣٧٥٥، من طبعة دار المعارف بمصر. سەروچاوەی زۆری دیکەیش هەن کە هەمان چیرۆك دەگێڕنەوە کە د. عبدالسلام الترمنینی لە کتێبی "الرق الماضية و الحاضرة" باسی کردووە: سلسلة عالم المعرفة، عدد ٣٣، ص١٦٠" و د. أحمد الحوفي: المرأة في الشعر الجاهلي، دار النهضة بمصر، بالفجالة، ص٣٨٣.

١٣- أصول فلسفة الحق، المجلد الأول، ص٢٨.

١٤- ئەمە ئەو بۆچوونەیە کە زۆر توێژەری دیکەیش دەریاخستووە- بۆ نموونە بڕوانە "ج. د. وێست" چی دەڵێت: "ژیاری یۆنانی هەر لە بنەڕەتەوە ژیاری پیاوە ئەمەش بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕۆڵە لاوەکییەی ژن لای یۆنانییەکان گێڕاوییەتی". بڕوانە: D. J. West: Homosexuality, p»٢٤.

١٥- ول ديورانت: قصة الحضارة، المجلد السابع، ترجمة الأستاذ محمد بدران، ص١١٧.

16- J. B. Elshtain: Public Man & Private Woman, P. 14.

17- Ibid, P.12.

18- Susan M. Okin: Woman in Western Political Thought, P.15.

19- Engles E.: The Origin of The Family Private property and the State, Moscow, 1968.

20- Quoted by: J. K. Anderson in his "Xenophon, P.177, Duck Worth 1974.

٢١- ژن لە کۆمەڵگەی سپارتەدا پێکهاتبوون لە ژنی ئازاد و کەنیزەك. بەڵام لە ئەسینادا گروپێکی دیکەیش هەبوون ئەوانیش ژنە بیانییەکان بوون. دواتر دەگەڕێینەوە سەر ئەم بابەتە.

22- Donaldson, James: Women: Her position and Influence in Ancient Greece and Rome, P.73.

23- Gurbe G.M.A.: Plato's Thought, P.88.

24- Donaldson: Op. cit.

٢٥- ول ديورانـت، المرجـع نفسـه، مجلـد ٧، ص٤٧٠-٤٧١؛ هـەروەها: د. أحمـد فـؤاد الأهـواني، أفلاطون، ص١٣٨.

26- Susan M. Okin: Op. Cit, P. 15.

٢٧- "سارە پۆمیرۆی" پێی وایە ئەفسانەکان تەنیا کۆمـەڵێك درۆ نـین بـەڵکو هـەوڵی مـرۆڤن بـۆ سەپاندنی سیستەمی ڕەمزی بەسەر گەردووندان، میتۆلۆژیای یۆنانییش یەکەم "ئاماژە"مـان لـەبارەی پەیوەندی پیاو و ژنەوە لەم ژیارەدا پێ دەدات، بۆیە توێژینەوەی ئەفسـانە دەسـتپێکێکی پێویسـتە بـۆ توێژینەوە لە مێژووی ژن. بڕوانە کتێبەکەی: النساء في العالم القديم- المقدمة ، ص١ و ٢.

28- James Donaldson: Op. Cit: P.11.

٢٩- ول ديورانت: قصة الحضارة، مجلد ٦، ص٩٦- ٩٧.

30- Donaldson: Op. cit, P.12.

٣١- د. عبداللطيف أحمد علي: تأريخ اليونان، المجلد الأول، ص٥١.

32- Elshtain, Jean Bethke: The Family in Political Thought,P.11-12.
33- M. I. Fenly: The world of Odysseus, P. 138.
34- Sarah B. Pomeroy: Women in Classical Antiquit, P.7-8.

٣٥- بڕوانە: د. عبداللطيف علي أحمد في كتابه السابق، ص٢٢٩؛ و دريـني خشـبة: أسـاطير الحـب و الجمال عند الإغريق، مجلد ١، ص٤٠.

٣٦- ئەفلاتوون ئامـاژە بـەم چـیرۆکە دەدات بـەڵام نایـەوێت "زیـۆس" بخاتـە بـەر ئـەم تۆمەتـە ئابڕووبەرانەیە و وای دەبینیت کریتییەکان ئەم چیرۆکە دروستیان کردووە تـا پاسـاوێکی خـودایی بـۆ تێرکردنی شەهوەتە شازەکانیان ببیننەوە. بڕوانە: محـاورة القـوانين، كتـاب الأول، ٦٣٦حــ- و محـاورة فايدروس، ٢٥٥حـ.

٣٧- ول ديورانت، المرجع نفسه، مجلد ٦، ص٩٧.

38- Sosan M. Okin, Op. cit, P. 16.

٣٩- هۆکاری ئەم سەرئێشە تووندە ئەوەبوو "زیۆس" حەزی لە میـتس Metis ـی خـوازنی هـۆزە توووندوتیژە سەرەتاییەکان بوو، ئەو بە چەندین شێوە لە دەستی زیۆس هـەڵهات بـەڵام هـەر دواجـار گرتی و لەگەڵی جووت بوو، ئیدی سکپڕ بوو، پێشبینی ئەوە کرا منداڵەکە کـوڕ دەبێـت و ئەچـێتە سەر عەرشەکەی باوکی، وەك ئەوەی زیۆس خۆیشی لەگەڵ کرۆنۆسدا کری، بیـە زیـۆس غـەمی لـە

خۆی خوار و بە وتەی شیرین و شەکراو "میتس"ـی لە خشـتە بـرد و ئیـدی ئـەویش ملـی بـۆدا، زیۆسیش لەناکاو دەمی کردەوە و قووتی دا. زیۆسی گەورە خواوەند ئەم ڕووداوەی لـەبیرکرد و ڕۆژان و مانگان تێپەڕین، کاتێك بەسەر دەریاچەی تریتۆندا دەگەڕا کتوپڕ سەرئێشەیەکی توندی گرت، تـا ئەوەی وای هەست دەکرد سەری دەتەقێت، لە زۆریی ئازارەکەیدا وەك شێتەکان دەلالایەوە تا ئەوەی هیفاستیۆس بە یەك لێدانی تەورەکەی لەو ئازارەی ڕزگار کرد.

٤٠- ئەم خەسلەتە "پیاوانە"یان پالەوانانە کە هەندێك لە خواوەندە مێیــەکان هــەیانبوو، لەلایـەن خواوەندەکانیشەوە بابەتی سەرسوڕمانێکی زۆر بوو، ئەمەش بەڵگـەی ئەوەیـە کـە کۆمەڵگەکـەیان نێرسالار بووە. خۆ پاکیزەی سیرینا Cyrene لە ئارتەمیس دەچوو، لێی دەگێڕنەوە دوو سەگی ڕاوی پێشکەش بە وەحشە وشکاوەکییەکانی شـوانی مەڕوبزنـەکانی بـاوکی کـردووە. ئـەپۆلۆی خواوەنـد کا تێك دەیبینێـت بـە بـێ چـەك ململانـێ لەگـەڵ شـێر دەکـات پێـی سەرسـام دەبێـت و بـەهۆی "ئازایەتییەکەی"ـشیەوە بەخێرایی سەرسامییەکەی ئـەپۆلۆ دەگۆڕێـت بـۆ خۆشەویسـتییەکی بـێ ئامان. ئەو کات "ئەتلانتا" لە هەموو ولاتی یۆناندا مەڵبەندی ڕاوچییان بوو، ئـەو بـە یەکـەم تـیر بەرازەکا دڕندە وشکاوەکییەکانی دەپێکا کە پەلاماری خەڵکیان دەدا، کاتێك باوکی ویستی بیـدات بە شوو مەرجی ئەوەبوو شوو بەو کەسە دەکات کە بەسەریدا سەردەکەوێت و مـردنیش چارەنووسـی دۆڕاوەکانە، لەبەرئەمە داواکارەکانی لێی کشانەوە و ئەویش بە پاکیزەیی مایەوە..هتـد. هـەروەها ئارتەمیس Artemis ی خواژن (دیانا لای ڕۆمانەکان) خواژنی ڕاو بوو کە تیرەکانی زۆر لە دوورەوە دەهاویشت. هەروەها وای پێ باشتر بوو ڕۆژەکانی لە نێو شاخ و داخ و دارسـتانەکان لەگـەڵ ئاژەڵـە دڕندەکاندا، دوور لە خواوەندەکان و خەڵکی، بەسەر بەرێت. بڕوانە:
Sarah Pomeroy: Op. cit, P.5.

٤١- بڕوانـە وتـەی سـارە پـۆمیرۆی لـەبارەی خواژنـە ئەسـینایيە "پیاوانە"کانـەوە، زۆرێـك لـە سیفەتەکانی هی پیاون، ئەویش جەنگی پاراستنی قـەلا و شـوورەکان بـوو، زۆرێپۆشـی دەپۆشـی و خودەیەکی لەسەر دەکرد و بە زۆریش جلی پیاوانەی لەبەر دەکرد تا خزمەتـەکانی خـۆی پێشـکەش بکات، وەك ئەوەی لەگەڵ ئۆدیسۆس کردی. لا٤٧.

٤٢- د. عبداللطيف أحمد علي: المرجع السابق، ج١، ص٦٣.

٤٣- ولد ديورانت، المرجع السابق، مجلد ٧، ص١٠٣.

٤٤- پرۆمیسیۆس "زیۆس"ـی هەڵخەڵەتاند کاتێك گۆشـتی بـرژاوی ئـاژەڵی سـەربڕدراوی دابـەش دەکرد، کە کرابوونە قوربانی بۆ خواوەندەکان، جا خەلوزی لە جیاتی گۆشت بە زیۆس دا. زیۆسـیش تووڕەبوو و ئاگری لە مرۆڤ شاردەوە.

٤٥- ئەفسانەکە ڕادەی کینەیـەکی لەمێژینـەی ترادسـیۆنی یۆنـانی بەرامبـەر بـە ژن دەردەخـات، ئەفرێنەرەکەی خودایەکی گێڕوویڕە، بە دوو قاچی پێچەوانەوە هاتۆتە دونیا کە پەنجەکانی لە دواوەن و پاژنەکانیشی لە پێشەوە، لە "هیرا"وە لەدایك بووە، کاتێك کەوتبووە حـاڵی تـووڕەیی بەرامبـەر زیۆس و پێش لە وادەی لەدایکبوونی خۆی، سکەکەی دانا.

٤٦- ئەمە ئەو سندووقە بوو کە زیۆس بە بۆنەی هاوسەرگیریی بنـدۆراوە بـە دیـاریی بـۆی نـارد و هەموو کارەسات و خراپەکانی تێدا بوو.

٤٧- د. محمد كامل عياد: تأريخ اليونان، الجزء الأول، دار الفكر بدمشق، ص١١٧.

٤٨- المرجع نفسه، ص١١٨-١١٩.

٤٩- ئەم وێنە تاریکەی کە لە سەردەمی کلاسیکیدا لـەبارەی ژنـەوە هـەبوو هـەر مایـەوە، بۆیـە دەبینین هیپۆلیتۆس Hippolytus لە شانۆی بەناوبانگی یۆرپیـدس دا بـە ناڕەزاییـەوە لـە زیـۆس دەپرسێت: «بۆچی ژن ئەو هەموو نەفرەتەی بۆ ڕەگەزی مرۆیی هێناوە؟ ئایـا نـەدەکرا منـداڵان لـە پەرستگاکاندا لەبەرمبەر زیێڕ و زیو و پارچەی نەقدیی برۆنـزدا بفرۆشـرێن، ئینجـا دوای ئـەوە بـە ئازادی و دوور لە مێینە بژیابایین»؟ بەیتەکانی ٦١٥-٦٢٠، جا ئەفلاتوون پێی وایـە چاوچـنۆکی و داواکارییە بێ بڕوانەوەکانی ژن، هۆکاری سەرەکی داڕزانی سیستەمی فەرمانڕەوایەتی دیموکراتییـە. "الجمهورية ٥٤٩ د.

٥٠- أرنست باركر: النظرية السياسية عند اليونان، الجزء الثاني، ص٧٥.

51- Quoted by: J. K. Anderson in his "Xenophon, P.177, Duck Worth 1974.

٥٢ لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە لەم سەردەمەدا هەرچی سیفەتی دواکەوتوویی هەیە ئـەهێنرێت بـە ملی ژنی ڕۆژهەڵاتدا کە هیرۆدۆت سەردانی میسری کردووە و زۆر سەری لەوە سوڕماوە بینیـووەتی پیاوەکان لە ماڵدا کەتان دەچنن، کەچی ژنەکان لە بازاڕەکاندا خەریکی کڕینـی پێداویسـتییەکان و

کڕین و فرۆشتنی شتی دیکه و کارکردن له کێڵگەکاندا دەبن، وەك ئەوەی له بۆچوونی ئەودا دنیا سەراوژوو بووبێتەوە! ئەو دەڵێت: «میسری شتی سەیری هەیە.. بۆیە میسرییەکان زۆر جیاوازن. پیاوەکانیان لەماڵدا دەمێننەوە و خەریکی رستن و چنین دەبن»! هیرودت یتحدث عن مصر، ترجمة: د. محمد صقر خفاجة، دار القلم، ١٩٦٦، ص١١٦-١١٧. وەك دکتۆر ئەحمەد بەدەویش دەڵێت هەڵبەت کارکردن له کێڵگەکاندا بە پاڵ پیاوەکانەوە بووە، لا١١٦. ئەوەش ڕادەی هەڵەی توێژەرانمان بۆ دەردەخات، لەوانەش ویل دیۆورانت، کە دەڵێت: «وا پێدەچێت ئەسینا لە سەروەختی شکۆ و سەربەرزی خۆیدا زیاتر ڕۆژهەلاتی بووە تا ئەورووپی». قصة الحضارة، مج ٧، ص١٠٣.

٥٣ ڕاستییەکەی بەکارهێنانی حیجاب زۆر له کۆمەڵگەی یۆنانی کۆنترە، بۆ نموونە لە مارشی مارشەکاندا هاتووە "تۆ جوانیت خۆشەویستەکەم، چاوەکانت لەو دیوی ڕووگرەکەتەوە جوانن، گۆناکانت لەو دیو ڕووگرەکەتەوە وەك لەتی هەنارن».. ئیصحاحی چوارەم: ١-٤.

54- Itherriaque: Les Idees de Platon, P.53 (Qouted by S. Okin, P.36).

٥٥- بڕوانە: سوفوكليس: نساء تراخيس، ترجمة: د. علي حافظ، (المسرح العالمي، عدد ٢٦)، ص٩٢.

56- Donaldson, Op. cit, P.5.

٥٧- وێڕای ئەم سزا سەختانەش کەچی خیانەت هەر هەبوو، وایش پێدەچێت، وەك سیمۆن دی بوژوار لەسەر هەق دەڵێت، ژن بە خیانەت تۆڵەی خۆی لە جەوری پیاو دەکردەوە، دواتر دەگەڕێینەوە سەر ئەم بیرۆکەیە.

58- Demosthenes: Private Qrations, P.177. (Quoted bu S. M. Okin, P.20).

59- S. M. Okin, Op. cit, P.20.

60- Xenophon, by J.K. Anderson, P.177.

٦١- د. عبداللطيف أحمد علي: تأريخ اليوناني، المجالد الأول، ص٥٩.

٦٢- تشارلز الكسندر روبنصن: أثينا في عهد بركليس، ص٨٦-٨٧، ترجمة: د. أنيس فريحة، لبنان، ١٩٦٦.

٦٣- بیانی ئەوەبوو کە نەوەی شارەکە نەبوو تەنانەت ئەگەر یۆنانیەکی شارێکی دراوسێیش بووایە. بە دڵنیاییەوە کەسی بێگانە کۆیلە نەبوو بۆ کڕین و فرۆشتن و بەزۆریش بەهۆی دیلی لە جەنگەکاندا دەهێنران.

64- James Donaldson: Op. cit, P.58.

٦٥- هەندێك لە توێژەران وای دەبینن "دیۆتیما" کەسێتییەکە ئەفلاتوون خۆی دایهێناوە، بەڵام ئەم گریمانەیە زۆرێك لە توێژەران ڕەتیان کردۆتەوە، ئەمانە پێیان وایە دیۆتیما ژنێك بووە لە ژنە بێگانەکان لە ئەسینادا. المرجع السابق، ص٦٠.

66- Xenophon: Memorabilia of socates Book III. Ch. XI.
67- Plato: Menexenus 137d-238b (Jowett Vol, I. P.684-685).
68- Donaldson, Op. cit, P.61.
69- Ibid, P.62.

٧٠- بڕوانە: مونیك بیتر: المرأة عبر التأریخ، ترجمة: هریت عبودي، دار الطلیعة، بیروت، ص٦٠.

71 Glenn R. Morrow: Plato's Cretan City, P.40.

٧٢- کرتیاس Critias سەرۆکەی شۆڕشی ئۆلیگارشی لە کۆتایی جەنگدا کوڕی دایکی بوو، کتێبێکی نووسیوە و تێیدا ستایشی دەستووری سپارتەی کردووە. ئەفلاتوون لە نامەی حەوتەمدا (٢٣٤ هـ) پێمان ڕادەگەیەنێت کە کریتیاس داوای هاوکاری کردووە "چونکە سەرقاڵبوونی من بەسیاسەتەوە بێ چەند و چوون بوو". بڕوانە وەرگێڕدراوە عەرەبییەکەی نامەی حەوتەم، ترجمة: د. عبدالغفار مکاوي في کتابە "المنقذ"، ص١٢٥" و کتاب مورو السابق، ص٤١.

73- S.G. Bell: Op. cit, P10.

٧٤- د. لطفي عبدالوهاب: الیونان، ص١٢٦.

75- G.R. Morrow: Op. cit, P.42.
76- Ibid.
77- Arsitotle: Politics, B. H. Ch IX, 1296.
78- G. R. Morrow: Op. cit, P.52.

٧٩- ئەم ڕێکخستنە کە دەوڵەتدەکات بە سوپایەکی گەورە لە زۆربەی کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا هەبووە، (د. ثروت الأسیوطي) دەڵێت: «ڕەوشی بەرگریکردن و هێرشبردن لای ماسای و ئەو کۆمەڵگایانەی کە سنوورێکی کاڵ و تەوا دیارینەکراویان نییە وەك زەوییەکانی ساڤانا، دەبوو هەمیشە سوپا بە تەواوی سەرباز و کەل و پەلەکانییەوە ئامادە بووایە بۆ هەر پێشهاتێك، بۆ ئەوەی بتوانێت بەر بە دوژمن بگرێت و بۆسەی بۆ بنێتەوە و تێکی بشکێنێت، ئینجا شوێنی بکەوێت. ئەم ئامانجە پێویستی بەوە بوو جەنگاوەرەکان لە کارە مەدەنییەکان و بارگرانی خێزان دوور بخرێنەوە. بۆیە تا تەمەنی سی ساڵی هاوسەرگیرییان لێ قەدەغەکرابوو و ڕەبەنییان بەسەردا سەپێنرابوو، تا

ئەو کاتەی لە هونەری جەنگدا تەواو شارەزا دەبن و ناوبانگ و سەربەرزی بەدەست دەهێنن، ئیدی ئەو کاتە شایەنی ئەوەن پشوو بدەن و لە ئارامیدا بن، ئەو کات لە سوپای کاراوە دەگوازرێنەوە بۆ هێڵە یەدەگەکان، تا ئەم کاتەش سامانی ئەوتۆیان کۆکردۆتەوە کە بتوانن لە ژیانی مەدەنیدا لە ئاسوودەیی و بێ خەمیدا بن. نظام الأسرة بين الإقتصاد و الدين، ص٩٧. خوێنەر سەرنجی ئەوە دەدات ئەم کۆمەڵگە و ڕژێمی سپارتەیی لە چەندین ڕووەوە زۆر لە یەك دەچن.

80- G. R. Morrow: Op. cit, P.52.

٨١- وشەیەکی یۆنانی بوو بەمانای بزن و مەڕ و جوانەگا. بڕوانە: مورو، ص٥٣.

82- A.H. Jones: Sparta, P.34, Blackwell, 1968.

٨٣- بەراوردی بکە بە وتەی هیگڵ «هەستکردن بە شەرم بە تەواوی دەردەکەوێت لە جیابوونەوەی مرۆڤ ژیانە سروشتی و هەستەکییەکەی و ئاژەڵ هەرگیز ناگاتە ئەم جیابوونەوەیە، بۆیە هەست بە هیچ شەرمێکیش ناکات، دەبێت بەدوای بنچینەیەکی ڕوحی و ئەخلاقیدا بگەڕێین بۆ پۆشاك لەوەدا کە مرۆڤ هەست بە شەرم دەکات». موسوعة العلوم الفلسفية، دار التنوير، بيروت، ١٩٨٣، ص١١١.

84- James Donaldson: Op. cit, P.27.

٨٥- د. محمد كامل عياد: تأريخ اليونان، مجلد ١، ص١٨٥.

٨٦- بە زۆری فڕاندنی ژنان قۆناغی ڕاگوزەر بووە لە هاوسەرگیریی دەستەجەمعییەوە بۆ هاوسەرگیریی تاکەکەسی، کاتێك گەنجێك بە یارمەتی هاوڕێکانی کچێکی هەڵگرتووە هەموویان بەسەرە لەگەڵیدا نوستوون، وەلێ دوای ئەوە بە ژنی ئەو گەنجەیان دانراوە کە خاوەنی بیرۆکەی ڕەدووکەوتنەکە بووە. بڕوانە: عبدالهادي عبدالله، المرأة و الأسرة، مجلد ١، ص١٦. وەك دوای کەمێکی تر دەبینین ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە لە سپارتەدا باو بووە.

٨٧- ول ديورانت، المرجع السابق، مجلد٦، ص١٥٧-١٥٨.

88- Beauvoir (Simone): The Second Sex, Trans. By H. M. Parshley, Penguin Books, 1987, P.120-121.

89- Ibid, P.89.

90- Aristotale: Politics, Book II, CH. IX, 1270 a.

٩١- د. وهيب سمعان: الثقافة و التربية في العصور القديمة، ص١٩٤.

٩٢- ول ديورانت ئيقتيباسی كردووه. قصة الحضارة، مجلد ٦، ص١٥٨-١٥٩.

٩٣- د. علي عبدالواحد وافي: المرجع السابق، ص٣٦.

٩٤- فتحية سليمان: التربية عند اليونان و الرومان، ص١٣.

95- Rousseu J., Emile, Trans by Barbara Foxley Exerymanis Liberary, N. 518.
96- Ibid.
97- J. Donaldson: Op. cit, P.31.
98- Engles E.: The Origin of The Family Private property and the State,P.63.

٩٩- ول ديورانت: قصة الحضارة، مجلد ٦، ص١٥٨.

١٠٠- المرجع نفسه، ص١٥٤.

101- Engles: Op. cit, P.63«
102- Ibid.
103- J. Donaldson: Op. cit, P.31.

١٠٤- د. عبدالسلام الترمانيني: المرجع السابق، ص١٧.

105- Simone de Beavoir: Op. cit, P.562.
106- J. Donaldson: Op. cit.

١٠٧- ول ديورانت: قصة الحضارة، مجلد ٦، ص١٥٧.

١٠٨- هەندێك وا دەگێڕنەوە كە بووكی سپارتەیی لە شەوی بوكێنیدا جلی پیاوانەی دەپۆشی و قژیشی وەك هی ئەوان دەبڕی: ئایا ئەمە مۆڵەتوەرگرتن بووە بۆ چوونە نێو ژیانێكی نوێ؟ ڕەنگە..! یان گەنجی سپارتەیی كە بە هاوڕەگەزبازیی ڕاهاتبوو زیاتر بە ڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵ بوكەكەیدا كردووە گەر خۆی وەك پیاو لێ كردبێت؟ ئەمیش ڕەنگە..! بڕوانە:
Sarah B. pomeroy: Op. cit, P.37-38.

١٠٩- ول ديورانت: قصة الحضارة، مجلد ٦، ص١٦٣.

١١٠- د. ثروت الأسيوطي: المرجع السابق، ص٣٩.

111- Xenophon: On The Spartan constitution in "Sources in Greek Political Thought', P.236.
112- A.H. Jonse: Sparta, P.135.
113- Ibid, Blackwell.
114- Aristotale: Politics, Book II, 1970 A.

115- Aristotal: Op. cit.

١١٦- بە ژمارەی بڕگەکانی ئەفلاتوون ئاماژە بە دەقەکان و ژمارەی ئەو چوار بەرگە دەکەین کە بنیامین جویت لە وەرگێڕانە بەناوبانگەکەیدا بۆ سەرجەم دیالۆگەکانی ئەفلاتوون کردوویەتی، ئەوەش بۆئەوەی خوێنەر ئاسان بۆی بگەڕێتەوە، ئینجا لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەدا ئاماژە بە سەرجەم ئەو لێکۆڵنەوانە دەدەین کە سوودمان لێیان وەرگرتووە.

١١٧- ئەم چینانە سێ چینی داخراو نەبوون بۆ نموونە وەك ئەوەی لە کاستەکانی هیندا هەیە «بەڵکو دەبوو نەوەی پاسەوانەکان بچنە نێو چینەکانی ترەوە و منداڵە بەهرەمەندەکانی چینەکانی تریش بۆ ئاستی پێگەی پاسەوانەکان بەرز بکرێنەوە». ٤٢٣.

١١٨- «بێگومان بەشێکی زۆری بۆچوونی ئەفلاتوون لەبارەی ئافرەتەوە لەو وێنە ئایدیالییەی وەرگرتووە کە بۆ ژنی سپارتەیی کێشاویەتی. ئەگەرچی ئەفلاتوون لە سپارتەییەکانیش دوورتر ڕۆیشتووە. سارة بوميري: النساء في العصر الكلاسيكي القديم، ص١١٧.

١١٩- جەختەکان لەسەر هەموو دەقەکانی ئەفلاتوون لەلایەن ئێمەوەیە.

120- Nettelship, R.L.: The Theory of Education in the Republic of Plato, P.40.

١٢١- المرجع السابق و أيضاً د. فؤاد زكريا: دراسة الجمهورية أفلاطون، ص١٠١-١٠٢.

١٢٢- بۆ نموونە بڕوانە لەم وتەیەی «لە توانای هیچ ژنێك یان لاوێك یان ئاژەڵێکدا نییە ئەوە دیاری بکات کە چی گونجاوە و خۆی دەرمانی خۆیی پێ بکات». تیتاتوس ١٧١ عـ حـ٣، ٢٧٠-٢٧١.

١٢٣- إرنست باركر، المرجع السابق، المجلد الثاني، ص٦١.

١٢٤- ئەم پرەنسیپە لە قوتابخانەی سپارتەییدا ناسراو بووە کە لە هەندێك ڕێنماییدا لەژێر کاریگەری سپارتەدا بووە «کۆمەڵی فیساگۆرییەکان مومارەسەی مەشقە وەرزشییەکانیان کردووە بۆ بونیاتنانی جەستە وەك بەشێك لە ڕژێمی ڕۆژانە، هەورەها لەسەر خوانی هاوبەش نانیان دەخوارد، فیساگۆرس ئەم بیرۆکەیەی لە سپارتەییەکان و کریتییەکان وەرگرتبوو». P. Gorman: Pythagoras: Alife, P.130. هەروەها بڕوانە لە وتەی ئیرنست بارکەر کە دەڵێت ئەم سروتە هی کۆمەڵی فیساگۆرییەکان بووە. النظرية السياسية، مجلد ٢، ص٥٨.

١٢٥- إرنست باركر، المرجع السـابق، ص٦٣. ئـەو پێـی وایـە ئـەم چـینە خـاوەنی سـەرمایەیە و دەسەڵاتی ئابووری بەدەستەوەیە، ص٦٨.

١٢٦- المرجع السابق، ٦١.

١٢٧- بارکەر دەڵێت: «ئەفلاتوون نـەیتوانی ئـەوە بسـەلمێنێت کـە پیـاوی دادپـەروەر لـەوانی تـر بەختەوەر ترە.. بۆیە بەوەندە وازی هێناوە بڵێت دادپەروەری بریتییە لە هارمۆنیای نێوان بەشـەکانی دەروون و ئەمەش دەبێتە ماوەی تەندروستی باشی ڕۆژانە و ئینجا دەبێتـە مایـەی بەختـەوەری». المرجع السابق، ص٦٥.

128- Susan M. Okin: Op. cit, P.98.

١٢٩- بارکر: المرجع السابق، ص٧٤.

١٣٠- إرنست باركر: المرجع السابق، ص٧٤. ئـەم پەیوەندییـە بـە نزیکـەیی لـە تـەواوی مێـژوودا هەبووە، هیرۆدۆت پێی وایە گەلی ئەگاسیری Agathyrsi تـا ئـەو ڕادەیـە مومارەسـەی سێکسـی دەستەجەمعییان کردووە کە هەموویان وەك یەك خێزانیـان لێ هـاتووە، هـەموو شـتێکیان لەگـەڵ یەکدا هەبووە، ئەوان برا و خزم بوون و هیچ کەسێکیان لەگەڵ ئـەوانی تـردا بـە حەسـوودی و ڕق و کینەوە مامەڵەی نـەکردووە. ڕاسـتییەکەی ئـەم بیرۆکەیـە هـی کۆمەڵگـە سـەرەتاییەکانە، بۆیـە ئەسینابییەکان لەسەر هەق بوون کاتێك وا تەماشای سپارتەییەکانیان کردووە کە وێڕای دەسـتبالاّییە سەربازییەکەیان کەچی گەلێکی دواکەوتوو و بەربـەرین. بـۆ نموونـە بڕوانـە: سـارة بـوميري: المرجـع السابق، ص١١٦. و سيمون دی بوفوار: الجنس الآخر، ص١١٩-١٢٠.

١٣١- د. فؤاد زکريا: المرجع السابق، ص٧٨.

132- B. Roussell: Marriage & Morals, P.7.

133- Semone de Beavoir: Op. cit, P.119-120.

١٣٤- ئەوەی "ئیـدوارد تـایلۆر" فەیلەسـوفی بـەناوبانگی ئـەفلاتوونی دەیلێـت ئەوەیـە کـە نـە سۆشیالیزم و نە کۆمۆنیزم لە کۆمـاردا هەتـەریان نییـە و لەمـەدا ئالۆزییـەك ڕوویـداوە، چـونکە ئەفلاتوون دەوڵەمەندی و هەژاریی وەلاناخات.. تایلۆر هـەتا لاپـەڕە ٢٧٦ بـە ڕێگەیـەکی نـەرێنی پشت ئەستووری بیرۆکەکەی ئێمە دەکات، چونکە دەبینین لە لاپەڕی دواتر دەڵێت: «پێویست بەوەش ناکات بیلێین کە سۆشیالیزم لە کۆماردا بوونی نییە، ئیدی کۆمۆنەبوونی ژنیشی تێدا نییە. چـونکە

بەیەکگەیشتنی پاسەوانەکان و ژنان سوومەند دەبێت و بگرە بۆ ئەو کۆت و بەندانەی وا لە کـۆت و بەندی کۆمەڵگەی مەسیحی توندترن، ملکەچ دەبێت» (ص٢٧٧-٢٧٨)، کەواتە ئەو کۆمۆنـەبوونی خاوەندارێتی و کۆمەنەبوونی ژنان بە تووندی لێك گرێ دەداتەوە و پێی وایـە سـڕینەوەی یەکـەمیان دەبێتە مایەی سـڕینەوەی دووەمیشـیان. بڕوانـە کتێبەکـەی تـایلۆر: Plato: The man & his work, P.277-278.

135- G. M. Grube: Op. cit: P.98.
136- Sarah Pomeroy: Op. cit, P.116.
137- G. R. Grube: Op. cit, P.89-90.
138- Ibid, P.89.
139- Sarah Pomeroy: Op. cit, P.117.

١٤٠- سەیر لەوەدایە ئەم پەیوەندییە تەنیا لە کۆمەڵگە سـەرەتاییەکاندا نـەبووە بـەڵکو لـە هـەر هەوڵێکی "شۆڕشگێڕانەشدا" بۆ پەرەپێـدانی ژیـانی کۆمەڵایـەتی ماوەتـەوە! خـۆ کاتێـك "گـزۆن هەمفـەری نـۆیزJ. H. Noyes" ـی کـاهینی پرۆتسـتانتی لـە سـەدەی ڕابـردوو لـە ویلایەتـە یـەکرگتووەکان دەرکـەوت و کۆمـەڵێکی ناسـراوی بـەناوی پێرفێکشنسـتەکان (کامڵخوازەکـان) Perfectionnists دامەزراند، کە کە هەوڵ بۆ کـامڵبوون لـەم دونیـا دەدەن، و سـاڵی ١٨٤٨ لـە شاری "ئۆنایدا" جێگیر بوون، و کۆمەڵەکەیشی بەناوی شارەکەوە ناونرا، موڵکایەتی و خاوەندارێتی سـامانی لـە یـەك گرێـدابوو، هـەروەها پشـتیوانی لـە بیرۆکـەی کۆمەنـەبوونی ژنـان دەکـرد و کۆمەڵکەیشی کردبووە بەرپرسی بەخێوکردنی مندالانی نێو کۆمەڵەکە!
Encyclopeadia Americana, arr, Oneida Community Vol. 20, P.734.

١٤١- الکسـندر کوریـە: مـدخل لقـراءة أفلاطـون، ص١٣٥، ترجمـة: عبدالمجیـد أبـو النجـا، الهیئـة المصریة، ١٩٦٦.

١٤٢- لە پێشەکییەکەی دیمۆند لییەوە کە بۆ وەرگێڕانی کۆمارەکەی ئەفلاتوونی نووسیوە، ص٤٧.
143- D. Lee: Op. cit, P.47.
144- Ibid.

١٤٥- ئەو ناتەبایی و نەشیاوییەی و لەمەدا هەن وا دەکەن سنووردارکردنی لەدایکبوون مەحاڵ بێت «چونکە ئەو ڕیسای هاوسەرگیرییەی کە بانگەشەی بۆ دەکرد تەنیا هی چـینی پاسـەوانەکان بـوو و

چینەکانی خوارەوەی نەدەگرتەوە کە ئەمانەی خوارەوە زۆرینەی ژمارەی دانیشتووانی دەوڵەتیان پێك دەهێنا». کۆمێنتێکی فؤاد زکریا لە وەرگێڕانی کۆماردا، لا٣٤٧.

١٤٦- إرنست باركر: المرجع السابق، الجزء الثاني، ص٧٩. (جەختەکە لە ئێمەوەیە).

147 Les Strauses: The City & Man, P.117.
148 Simone De Beavoir: Op. cit: P.65.

١٤٩ د. فؤاد زكريا: المرجع السابق، ص١٠١-١٠٢.

150- J. J. Rousseu, Emile, Trans by Barbara Foxley Everyman's Liberary, N. 51, P.326.
151- Sarah Pomeroy: Op. cit, P.116.

١٥٢- د. فؤاد زكريا: المرجع السابق، ص١٤١.

153- I. A. Sinclair: A history of Greek Thought, P. 156.

١٥٤- د. فؤاد زكريا: المرجع السابق، ص١٠٢.

155- Sarah Pomeroy: Op. cit, P118.
156- Glenn R. Morrow: Op. cit, P101

١٥٧- إرنست باركر: المرجع السابق، مجلد ٢، ص٢٥٦.

١٥٨- ئەمە هەمان دابەشکارییە باوەکەی ئەسینایە. سۆلۆن بە پێی داهاتی ساڵانەی هەر تاکێك بە پێوانەی دەغڵ و دان و زەیت و مەی کۆمەڵگەی ئەسینایی بۆ چوار چین دابەش کردبوو. چینی یەکەم داهاتی ساڵانەی پێنج سەد پێوانە بوو و پێیان دەوترا "چینی خاوەن پێنج سەدییەکان". چینی دووەم چینی سوارچاکەکان بوو کە داهاتی هەر تاکێکیان لە سێ سەد پێوانە کەمتر نەبوو. سێیەمیان چینی "بێگارەکان" بوون کە داهاتیان دوو سەد پێوانە بوو، لە خوارەوەی پەیژەکەشدا چینی کرێگرتە و کرێکارە دەستییەکان بوون. د. لطفي عبدالوهاب: اليونان..، ص١٢٦-١٢٧.

١٥٩- إرنست باركر: المرجع السابق، ص٢٥٨.

١٦٠- المرجع نفسه، ص٢٦٢-٢٦٣.

161- G. Morrow: Op. cit, P113.
162- Ibid, P.439.
163- Ibid.

١٦٤- بڕوانە وتەی یۆرپیدس لەسەر زمانی میدیاوە «هیچ دەرتانێك لەبەردەم ژندا نییە، ئەو ناتوانێت لە هاوسەرگیریدا بڵێت نا» بەیتی ٢٥٤.

١٦٥- إرنست باركر: المرجع السابق، مجلد ٢، ص٢٦٨-٢٦٩. (جەختەکە لەلایەن ئێمەوەیە).

١٦٦- المرجع نفسه.

١٦٧- المرجع نفسه، ص٢٦٧.

١٦٨- بۆ نموونە بڕوانە لە: "شانۆکانی میدیا" و "ئەلیکستس"ی یۆبیدس و "ژنانی ئەنجومەنی گەل" یان "ژنانی پەرلەمان"ی ئەرستۆڤان.. هتد.

169- Susan Okin, Op. cit, P48.
170- G. R. Morrow: Op. cit, P.331.

١٧١- مورو: المرجع السابق.

١٧٢- النساء في العصر الكلاسيكى القديم، ص١١٨.

173- Aristotle: Op. cit, Bll 12696.
174- Ibid, 12746.
175- Ibid.
176- G. R. Morrow: Op. cit, P.394-395.
177- Sarah Pomeroy: Op. cit, P.118.

١٧٨- سۆزان ئۆوکین پێی وایە «ئەمە مەترسیداترین وەزیفە بوو لە دەوڵەتدا (هاوتای وەزیری پەروەردە یان سەرپەرشتیاری گشتی فێرکردن بوو)، لەبەرئەمە ئەفلاتوون بە مەجی گرتووە کە پیاو لەو پۆستەدا بێت. بڕوانە کتێبەکەی، لاپەڕە ٤٨.

١٧٩- لە تەواوی دەقەکانی ئەفلاتووندا جەختەکان لە لایەن ئێمەوەیە.

١٨٠- مونیك بنتر: المرأة عبر التأريخ، ص٦١.

١٨١- د. عبداللطيف أحمد علي: تأريخ اليونان، المجلد الأول، ص٦٤.

182- Sarah Pomeroy: Op. cit, P.69-73.

١٨٣- شانۆی "میدیا"ی یۆربیدس، بەیتەکانی ٢٣٥-٢٤٥.

١٨٤- مونيك بيتر: المرجع السابق، ص٣٢.

١٨٥- جەختەکە لە هەموو دەقەکانی ئەفلاتووندا لەلایەن ئێمەوەیە.

186- Susan Okin: Op. cit, P.70.
187- Quted by S. G. Bell in (Women), P.8.
188- J. K. Anderson: Xenophon, P.177.

١٨٩- ول ديورانت: قصة الحضارة، مجلد ٧، ص١٨٠.

190- Aristotle: Politics BII Ch. 10, P.92.

١٩١- د. فؤاد زكريا: المرجع السابق، ص١٠٢. ئـەویش سـەرنجی خوێنـەر بـۆ کتێبەکـەی فسـتۆن ڕادەکێشێت: دفاع عن أفلاطون، ص١١٦.

192- Anderson: Xenohphon, P.137.

١٩٣- ئەم پەیوەندییەی نێوان پیاو و پیاو لە ئەلیادەدا لـەنێوان ئـەخیل و پترۆکلوسـدا هەیـە، تـا ئەوەی ئەخیل زۆر لە دوژمنەکەی تووڕە دەبێت و ئەمەش هۆکارە بۆ گەڕانەوەی بۆ شەڕ تـا تۆڵـەی ئەو لە هیکتۆری بکوژی هاوڕێکەی بکاتەوە! ئەمە لە مەلحەمەی گلگامێشی بابلیشـدا هەیـە کـە هەندێك توێژەر پێیان وایە لەنێوان گلگامێش و خوانی ئەفلاتوندا سیمای هاوبـەش هەیـە. بڕوانـە: الثقافة العالمية، عـدد ٤٥، ص٧. هەروەها لـە کتێبـی پیرۆزیشـدا لـەنێوان داود و یۆناسـاندا ئـەم پەیوەندییە هەبووە کە "لەسەرووی خۆشەویستی هەموو ژنێکەوە بـووە". سـامۆێلی دووەم: ١:٢٦. بگەڕێوە بۆ: ج. وست: الجنسية المثلية، ص٢٤.

194- M. Grube: Op. cit, P.89.
195- Ibid, P.92.
196- Ibid, P.89-90.

١٩٧- لایوس باوکی ئۆدیپ بوو —پاشای تیبە کە لە گەنجیدا تاوانێکی ئەنجامدا، بارودۆخ ناچـاری کرد لە وڵاتی خۆی هەڵێت و پەنا بباتە بەر پاشا پیلۆپۆس Pelopos ی بەخشندە کە داڵـدەی دا و ڕێزی لێنا و ڕزگاری کرد، لایۆسیش پاداشتی ڕێز و نەوازشـتەکەی بـە سـەنمار دایـەوە! جـا هـەلی گەمەکانی لە شـاردا قۆسـتەوە و خۆیسـپۆس Chrysippus ـی کـوڕی پیلۆپۆسـی مـارەکرد کـە منداڵێکی ئێجگار جوان و قەشەنگ بوو، باوکیشی زۆری خۆشدەویست و هەموو ئومێـدێکی پێـی بوو، بۆیە ئەویش عاشقی بوو. سزای خواکان دەسـتی پێکـرد کاتێـك لایـۆس لـە بـارەی نـەزۆکی "جوکستا"ی ژنییەوە ڕاوێژی پێکرد «خوداکان کوڕێك دەبەخشن، بەڵام قەدەر وای نەخشاندووە کـە مردنت لەسەر دەستی ئەو کوڕە بێت. زیۆسی کوڕی کرۆنۆس کە وەڵامی نەفرەتی پیلۆپۆسی دایـەوە بەهۆی ئەوەی کوڕە نازدارەکەی و تاکە ئومێدەکەی لە ژیاندا، لە تەختەکەی دایگرتبـووە خـوارێ». بەم جۆرە هەندێك لـە ئەفسـانەکان لەلایـەك پاسـاوی بـوونی سـازیی سێکسـیان لای یۆنانییـەکان داوەتەوە و لەلایەکی تریشەوە پاساوی (باوکخۆکوشتن)ـەکەی ئۆدیپ.

١٩٨- د. احمد فؤاد الأهواني: المرجع السابق، ص٥٣.

١٩٩- جورج سارتون: المرجع السابق، المجلد الثالث، ص٦٣.

200- Susan Okin: Op. cit, P.73.

201- G. Valstos: Platonic Studies, P.25.

٢٠٢- جورج سارتون: المرجع السابق، المجلد الثالث، ص٦٣.

٢٠٣- الموسوعة الفلسفية المختصرة (مادة: أفلاطون)، ص٥٤.

٢٠٤- كاينوس پاكيزە و جوان بوو کە پۆزيدۆن Poseidon ی خواوەند دەستدرێژی لێ کرد و پاشان ویستی ئەو ئاواتەی خوازیاری بوو وەدی بهێنێت، جا ئەویش داوای لێ کرد بیکات بە پیـاو تـا بـۆ جارێکی تر نەتوانرێت دەستدرێژی بکرێتە سەر، بۆیە خوداوەندەکە کردی بـە پیـاوێکی جـەنگاوەری نەبەرد!

٢٠٥- جورج سارتون، المرجع السابث، مجلد الثالث، ص٦٣. هەروەها بڕوانە: د. فؤاد زكريـا: المرجـع السابق، ص١٠٣.

٢٠٦- د. عبدالغفار مكاوي: سافو- شاعرة الحب و الجمال عند اليونان، ص١٣.

207- J. Donaldson: Op. cit, P.67.

٢٠٨- تا ئێستاش وشەی (سحاق) (واتە سێکسی مێینە و مێینە) لە ناوی Sappolism و وشـەی Lesbianism ـەوە داتاشراوە ئەوەش بە داتاشین لە ناوی ئەو دوورگەیـەی لیسـبۆس Lesbos ـی تێدا دەژیا.